چاپی سێیەم

خالید ئێرتوغرول

# جانان

## لێزمە بارانێک لە هەست



بسم الله الرحمن الرحيم


ناوی کتێب : جانان

نووسەر : خالید ئێرتوغروڵ

وەرگێڕ : سروشت ڕۆوف

دارشتنەوەی : بەهرە محمد علی

نۆبەی چاپ : سێیەم - ٢٠١٤

لەبەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان

ژمارە (١٥٢١)ی ساڵی ٢٠١٢ی پێ دراوە

ناوەندی ڕاگەیاندنی ئارا

بنکەی سەرەکی بڵاوکردنەوەی بەرهەمەکانی ناوەندی ڕاگەیاندنی ئارا – سلێمانی / شەقامی پیرەمێرد

0770 358 7100 - 0750 106 9589 - 0748 013 4669 ara.m@hotmail.com

# پێشەکی

کتێبەکانمان بەهۆی ئەوەی مەسەلە ڕاستەقینەکانی ڕۆژگار دەوروژێنن، لەلایەن خوێنەرەکانمانەوە پێشوازییەکی گەرمیان لێ دەکرێت. بەهۆی ئەم پەرۆشییە زۆرەی خوێنەرانەوە بۆ بەرهەمەکانمان کە چیرۆکی پڕپەندو بەسەرهاتی ڕاستەقینەو پڕئامۆژگارین، بەرهەمەکان پێوەری فرۆشتن دەشکێنن و لەم دەست بە ئەو دەست دەگەن.

ڕۆژانە لەڕێگەی نامەو تەلەفۆنەوە لە پەیوەندی بەردەوامدام لەگەڵ ئەو کەسانەی سوودی باشیان لە خوێندنەوەی کتێبەکان بینیوە.

ئەو نامانەیش کە پێم دەگەن بەسەرهاتی پڕپەندو گەڕانەوەی پڕحیکمەتی گەنجان لەخۆدەگرن. بە سوود وەرگرتن لە بەرهەمەکانمان ڕۆژانە ژمارەی ئەو گەنجانەی کە لە ژیان تێدەگەن و بەپێوەرە ڕاستەقینەکان بیرکردنەوەکانی خۆیان دەپێون لە زیادبووندایە. بێگومان هەست کردنی ئەو کەسانە بە هەڵەکانیان و گەڕانەوەیان لە هەڵدێر وەك پەروەردەکارێك و وەکو باوکێك هەستی خۆشحاڵی دەبەخشن.

ئەم بەسەرهاتە ڕاستەقینەیەی "جانان" خان کە لەسەر خواستی خۆی ناوی شوێن و کەسەکان گۆڕدراون و بەشێوازێکی ئەدەبی دامانڕشتوەتەوە. مەبەستیشمان لە بەرهەم هێنانی ئەم کتێبە تەنها بۆ

خوێندنەوەو چێژوەرگرتن نییە لە دەقە ئەدەبییەکان، بەڵکو خستنەڕووی چیرۆکی ڕاستەقینەی ئەو خانمەیە لە کێشمەکێشی ژیاندا و گەڕانی بەشوێن ژیانێکی ئاسودەدا. بۆئەوەی کە هەموو کەس و بەتایبەتیش قوتابیان بتوانن لەم بەرهەمە سوودمەندبن، ڕستەکان بەشێوەیەکی سادەو ساکار داڕێژراون. لەگەڵ ئەمەیشدا پێویستە ئاماژەیەکیش بەوە بکەم کە بۆچی زۆرجار بابەتی هاوشێوە لە بەرهەمەکاندا دووبارە دەبنەوە. ئەمەیش بۆتە پرسیاری زۆرێك لە خوێنەران، کە دوو هۆکاری هەیە: یەکەم، ڕووداوە گێڕدراوەکان و کردنیان بە ڕۆمان بەسەرهاتی ڕاستەقینەو زیندووی کەسانێکن کە تیایدا ژیاون و، ئێمەیش لەبەر فەنتازیا نەمان گۆڕیون.

دووەم، ئەو باس و بەسەرهاتانەی بە من دەگات لەناو کۆمەڵگەو بەتایبەت چینی گەنجانەوە سەرچاوە دەگرێت، هەربۆیە لەکاتی خوێندنەوەیاندا هەرکەس دەتوانێت پێوەر بۆ هەڵەکانی خۆی دابنێت و لێپرسینەوەی خۆی بکات. لەبەرئەوەیە کەئێمەیش ئەم مەسەلانە بە پێویست دەزانین و هەڵیان دەبژێرین.

هەر خوێنەرێك لە دیمەنێکی یاخود بەشێکی ئەم کتێبەدا خۆی دەبینێتەوە. بەو مانایەی ئەم کتێبە بە ئامانجی سوودگەیاندن بەژیانی هەمووکەس دانراوە. لەبەرئەوە ئێوەیش لەگەڵ "جانان" خاندا جێگەیەك لەناو بەسەرهاتەکانی کتێبەکەدا دەگرن.

بێگومان لەکاتی خوێندنەوەیاندا ئێوەیش دەڵێن: " ئەم باسانە نەبینراون و هەرگیز ئەمانەمان نەبیستون". چونکە منیش لەسەرەتاوە ئەو هەستەم بۆ دروست بووە و، ئەو شتانەم وتوە. لەمانەیش گرنگتر ئەوەیە کە دوای خوێندنەوەی کتێبەکە دەچنەوە ناو ژیانی تایبەتی خۆتان

و لەخۆتان دەپرسنەوە. هەروەها چاو بە کەسانی نزیکتاندا دەخشێنن و ئەم بەرهەمە پێشکەش بەو دۆستانەتان دەکەن کە لە پێویستی خوێندنەوەیدان.

فەرموون بۆ داستانی ژیانێکی پڕ لە ئارامگری، ئازارو خەم، ئیمان و خۆشەویستی... لەبیرتان نەچێت لەدوای خوێندنەوەی ئەم کتێبە زۆرشت لە ژیانتاندا دەگۆڕێت. بەهیوای نەسووتانی جانانەکانی تریش لەناو ئاگری ژیاندا..

خالید ئێرتوغروڵ

## لەبەرامبەر ئەم بەسەرهاتەدا
## دەستم کرد بە گریان

خانمێکی لاوی خوێن گەرم .. تەمەنی تەنها بیست و چوار ساڵ دەبێت ... بەلام لەناو ئازارە بەرگەنەگیراوەکانی ژیاندا بەردەوام بە بڵێسەی ئاگری ڕۆژگار دەسوتێت.

هەرکات چاوەکانی لێک دەنێت، لەجیاتی فرمێسک، ئازارو خەم دێنەخوار...

لەگەڵ ئەوەی ئەم خانمە لەبەهاری ژیانیدایە، بەلام هیچ هەستێکی بەهاریانە لەناو ژیانیدا بوونی نییە... بەهۆی ئەو ڕووداوە سەخت و بەرگەنەگیراوانەوە کە ژیانی شپرزە دەکەن، هەموو جوانییەکان لەبەرچاوی بێنرخن..

ئەو بەسەرهاتانەی دەیانگێڕێتەوە، ئەوەندە سووتێنەرن تەنانەت بە گوێگرتنیش لێیان مرۆڤ سەرسام و خەمبار دەبێت.

لەپاش لەدەستدانی خۆشەویستانیشی، هێشتا لەناو ئازارو ناڕەحەتیدا دەناڵێنێت. ئەم حەسرەتانە بە زمان و قەڵەم باس ناکرێن.

لەکاتی گوێبیستبوونم بۆ چیرۆکی ئەم خانمە کە لەو تەمەنە کورتەیدا ڕۆژەکانی بەئازار چنراون، بیرم نایەت چەندجار دەستەسڕەکەم بە سڕینی چاوەکانم تەڕکردووە. ئیتر گەیشتبوومە حاڵێك کە هەموو هەست و هۆشم

لەلای ئەو بوو و وەکو ئەو دەگریام. چونکە ئەو ڕووداوانە هەموو خۆڕاگرییەکیان لێ سەندبووم.

بەخۆمم وت دەبێت ئەو ژیانەی کە پێش هەمووان منی تاساندووە بگاتە خوێنەرەکانم و هەمووان بیخوێننەوە، هەربۆیە قەڵەمەکەمم گرتەدەست. سەرم سوڕمابوو لەوەی کە دوای ئەو هەموو ڕووداوانە هێشتا ئەو خانمە بەپێوە ڕاوەستاوە.

ئەم ڕووداوانە بە هەموو باشی و خراپیەکانەوە، بە هەموو دروستی و نادروستیەکانەوە، کە ئیمان پێوەریان بۆ دادەنێت و بە سەرەنجامی پڕپەند کۆتاییان دێت، هەمووان پێویستیان بە خوێندنەوەی هەیە.لەگەڵ ئەمانەشدا ئامانجی "جانان" خانیش هەرئەمە بوو دەیگوت:

– دەبێت گەنجان ئەم بەسەرهاتەی من بخوێننەوەو هەمان هەڵەکانی من دووبارە نەکەنەوەو هەمان ئازاری من نەچێژن.

بۆیە دەمەوێت ئەم چیرۆکە بەئازارو پڕئامۆژگارییە لەگەڵ خوێنەرەکانمدا بەش بکەم و دەرفەتی بیستنی ئەم ڕاستەقینانە بەئەوانیش بدەم. من بە فرمێسک ڕشتنەوە ڕووداوەکانیم خستوەتە سەر پەڕەکان، دڵنیام کە ئێوەیش بە گریانەوە دەیخوێننەوە..

بۆ ئەو هەستانەی کە بەرگە دەگرن...

فەرموون...

# بەشی یەكەم

## باوكو دایكم خاوەنی دوو ئایینی جیاواز بوون

### پوختەی ئەم بەشە

دایك و باوكم لەگەڵ ئەوەی هاوئایین نەبوون بەڵام خۆشەویستییەكی زۆر لەنێوانیان هەبوو. تاكە منداڵی ئەودوو خۆشەویستەش من بووم. لەپێناو ئەم خۆشەویستییە نەمرەدا هیچ نەمابوو بەسەریاندا نەیەت. ئێستایش بە بیرلێكردنەوەی سەرم سوڕدەمێنێ!!.

# دایکم جولەکە و باوکم مەسیحی بوو

جانان خان بەدەم گریانەوە بەوتنی ئەم قسەیە دەستی بەگێڕانەوەی چیرۆکی ژیانی کرد:

- ڕابردووی خێزانەکەم زۆر ئاڵۆزەو، پڕە لەسەرکێشی و ململانێ.

دایکم جوولەکەو باوکیشم مەسیحی بوو... باپیرە گەورەی هەردووکیان لە ئەستانبوڵ ژیاون، بەڵام باپیری باپیری باوکم لە فەرەنساوە هاتووەو لە دەوڵـەتی عوسمانیـدا کـاری کـردووە. باووبـاپیرانی دایکیشـم لەشـاری ئیزمیرەوە هـاتوون‌و لـە ئەسـتانبوڵ نیشـتەجێ بـوون. هـەردوو بنەماڵەکـە ساڵانێکی زۆر لە شاری ئەستانبوڵ ماونەتەوە.

باپیری باوکم لەگەڵ دەوڵەتی ئیسـرائیلدا دەسـتی بـەکار کـردووە بـەم هۆیەشەوە باوکم لە ئیسرائیل هاتووەتە دنیاوە.

باپیری دایکیشم بەهۆی کارێکەوە بەرەو ئیسرائیل کۆچی کردووەو هـەر بەم هۆیەشەوە دایکم لە ئیسرائیل لەدایك بووە.

قەدەر دایك و باوکمی لە ئیسرائیل بەیەك گەیانـدووە. بـەڵام دایکـم بـە جوولەکەیی‌و باوکیشم بەمەسیحییەتی دەستیان بەژیان کردووە.

هــەردوو بنەماڵەکــە هــیچ کــات لێبــووردەیی‌و باشــی‌و کــەلتووری عوسمانییـەکانیان لـەبیر نـەکردووە هەمیشـە بـەڕێزو پێزانینـەوە یـادی دەوڵەتی عوسمانییان کردووەتەوە.

دایکم قۆناغی سەرەتایی لە قوتابخانەیەکی حکومی ئیسرائیل خوێندووەو باوکیشم لە قوتابخانەیەکی مەسیحی خوێندوویەتیی. بەڵام لەقۆناغی ناوەندیدا هەردووکیان کەوتوونەتە هەمان قوتابخانەوە... لەبەرئەوەی هەریەکەیان لەپۆلێکی جیاواز خوێندوویانە، لەدوایین قۆناغی قوتابخانەدا بەیەکتری ئاشنا بوونو یەکیان ناسیوە.

دایکم لەگەنجیدا زۆر جوان بووە... هەمیشەش هەروا مایەوە. هەموو کەس پێیان دەوت کە خانمێکی زۆر جوانە. باوکیشم بەسەرکەوتنەکانی لەوەرزشەوانیدا، سەرنجی هەمووانی ڕادەکێشا.

عەشق و خۆشەویستی نێوان دایك و باوکم لەگەڵ تەواوبوونی قوتابخانەیاندا دەستی پێکردووەو هەرگیز کۆتایی پێنەهاتووە.

پاشان باوکم چووە بۆ فەرەنسا و ئابووری خوێندووە، دایکیشم لە ئیسرائیل بووە بە مامۆستای باخچە.

## خۆشەویستییەکی بێ وێنە :

باوکم پێش ئەوەی بڕوات بۆ فەرەنسا، ویستویەتی لەگەڵ دایکم هاوسەرگیری بکات، بەڵام لەبەر جیاوازی ئایینەکانیان ئەم هاوسەرگیرییەیان سەری نەگرتووە. سەرەڕای ئەوەش دایكو باوکم یەکتریان زۆر خۆش ویستووە و ئەم بەڵێنەیان بەیەکتری داوە: "یان پێکەوە هاوسەرگیری دەکەین، یان بۆ هەتا هەتایە چاوەڕوانی یەکتر دەبین".

باوکم دوای تەواوکردنی زانکۆ بەمەبەستی کارکردن لە کۆمپانیایەکی فەرەنسی هاتووە بۆ تورکیا، دایکیشم هەموو کۆتو بەندەکانی

تێکشکاندووەو هەموو شتێکی لەبەرچاو گرتووەو بەدوای باوکمدا ڕێگای تورکیای گرتووەتەبەر.

لە کۆتاییدا دایکمو باوکم لەشاری ئەسکەندەرۆنە هاوسەرگیرییان کردووە.

بەڵام بنەماڵەی باوکم و بنەماڵەی دایکیشم ئەم هاوسەرگیرییەیان پەسەند نەکردوە. بەم هۆیەشەوە هەردوولا بەتەواوی پەیوەندییان لەگەڵ پچڕاندون. تەنانەت بنەماڵەی دایکم زۆر تووڕەبوون و، چەند جارێك هەوڵی کوشتنی دایکمیان داوە، بەڵام خوای گەورە پاراستوویەتی.

لەم هاوسەرگیرییەیان من لەدایك بووم، وەکو کچی باوکێکی مەسیحیو دایکێکی جوولەکە..

دواتر دایکم لەبەر ئەو خۆشەویستییە زۆرەی کە بۆ باوکم هەیبووە بووە بە مەسیحی.

ئەم کارەی دایکم بەجۆرێك کاری لە دایك و باوکی کردووە کە دەستبەجێ لە میراتی خۆیان بێ بەشیان کردووە.

لەساڵی سێیەمی هاوسەرگیریی دایكو باوکمدا ڕووداوێکی دزی لەو کۆمپانیایەی کە باوکم کاری تێدا کردووە ڕووی داوەو، باوکمیان وەکو بەرپرس لەو ڕووداوە تۆمەتبار کردووەو بەو هۆیەشەوە خراوەتە زیندانەوە. بەڵام بەدڵنیاییەوە باوکم هەرگیز پەیوەندی بەو ڕووداوەوە نەبووەو ئەوە بەتەواوی بوختان بوو. بەداخەوە، سەرەنجام باوکمیان لەکارەکەی دەرکردووە. دایکیشم ڕۆژگارێکی زۆر سەختی گوزەراندووە. من ئەوکاتە تەمەنم دووساڵ بووە. لەبەر ئەوەی کەسە نزیکەکانیان لەلانەبووەو کەسانێکی هاوکارو یارمەتیدەریان نەبووە زۆر جار دایكو باوکم بێ پارە ماونەتەوە جاری وا هەبووە کە ئاتاجی پاروە نانێك بوون.

دایکم بەنهێنی باروdۆخی خۆیانی بەباوکی گەیاندووە، بەڵام ئەو وەڵامی کە لەباوکییەوە پێی گەیشتووەتەوە دایکمی بەتەواوی تێکشکاندووە:

-"ئەگەر مێردەکەت و ئەو منداڵە بەجێ بهێڵیت و بێیتەوە وەرت دەگرینەوە، ئەگەرنا نەکەیت بێیتەوە.."

## ئەو هەواڵەی کە لە بەندیخانەوە هات :

باوکم لەبەندیخانە بەهۆی کاریگەری ئەو مامۆستایەی کە لەوێ ناسیبووی موسوڵمان بووبوو. مامۆستاکەش پاش ئازادبوونی لەبەندیخانە زۆر یارمەتی دایکمی داوە. دایکم هەمیشە بەڕێزو پیاهەڵدانەوە باسی ئەو مامۆستایەی دەکرد. بەڵام لەگەڵ ڕۆیشتنی مامۆستاکە لەو ناوچەیە دیسانەوە سەردەمی نەهامەتی و پەرێشانی دەستی پێکردووەتەوە.

کاریگەرترین بەشی ئەم ڕووداوەش مردن و گیان سپاردنی لەناکاوی باوکم بوو، بەجۆرێك کە هەرگیز ڕاستی ڕووداوەکەمان بۆ ڕوون نەبووەوە. باوکم لەبارێکی باش و تەندروستدا بوو و، چەند ڕۆژێکی کەمی مابوو ئازاد بکرێت، لەپڕ گیانی سپارد، یاخود سیناریۆکەیان بەو شێوەیە داڕشتبوو...

کاتێك دایکم چووە بۆ بینینی باوکم و چاوی بەتەرمەکەی کەوتووە، بەتەواوی تێك چووە و داماوە خۆی بەپێوە پێ ڕانەگیراوە. چونکە دایکم بەڕادەیەك باوکمی خۆش ویستووە کە لەپێناوی ئەودا دەستی لە تەواوی ماڵ و سامانی دنیا هەڵگرتووە. هەر لەبەر ئەمەش بوو کە دایکم تا مردنی هەمیشە باسی باوکمی دەکردو گوزارشتی لەو خۆشەویستی و حەسرەتە دەکرد کە بەرامبەر ئەو هەیبوو.

من هەرگیز باوکی کۆچ کردوومم نەبینیوە، بەڵام وێنەیەکیم لایە.. کاتێك باوکم مردووە من زۆر بچووك بووم، بڕوا ناکەن چەندە سەیری ئەو وێنەیەم کردووە، چەندە ماچم کردووە، چەندە گوشیومە بەخۆمەوە... تا ئێستاش ئەو حەسرەتەی کە بەرامبەری هەمبووە کۆتایی نەهاتووە... ئاخ باوکە، ئاخ!..

## ئەو ڕۆژانەی کە هیچ کەس بەرگەیان ناگرێت :

دایکم دوای لەدەستدانی باوکم ژیانی تاریك بووە، دنیای بەسەردا ڕووخاوە. لەگەڵ من، کە ئەوکاتە تەمەنم دوو ساڵ بووە، بەتەنیا ماوەتەوە. لە هیچ لایەکەوە ئومێدێکی بەدی نەکردووە، لە هیچ کەسێکەوە پاڵپشتیو یارمەتییەکی پێ نەگەیشتووە. لەم دنیایەدا لەگەڵ کچێکی بچووکدا بەتەنیا ماوەتەوە... ئاخر چۆن بەرگەی ئەوە بگرێت، کێ هەیە بەرگەی ئەم تەنیاییو بێ کەسییە بگرێت؟

دایکم زۆر جار بیری لەگەڕانەوە بۆ ئیسرائیل کردووەتەوە... بەڵام نەکراوەو نەکراوە... نەیتوانیوە باوکم لێرە بەجێ بهێڵێتو بڕوات... ئەوە چ خۆشەویستییەکە، ئەوە چ عەشقێکە کە بەهۆیەوە سنگی بەم هەموو جەفایەوە ناوە... ئەو هەموو سەختیو ناڕەحەتییەی لەکۆڵی خۆی ناوەو لەباوکم دوورنەکەوتووەتەوە... باوکم ئەوکاتەی لەبەندیخانە موسوڵمان بووە، بەدایکیشمی وتووە کە موسوڵمان بێت، دایکیشم وتوویەتی:

–من موسوڵمانێتی نازانم. با تۆ لەبەندیخانە بێیتە دەرەوە، بەمنیش بڵێ کە لەبەر چی موسوڵمان بوویت، ئەگەر ئەوکاتە ئامادە بووم منیش موسوڵمان دەبم.

بەڵام کاتێک کە باوکم لەبەندیخانە کۆچی دوایی کردووە، ئەو ئارەزووەی دایكو باوکم نەهاتووەتە دی.

لەگەڵ مردنی باوکمدا، دایکم کەوتووەتە باروبۆخێکی زۆر ناڵەبارو هەژاریو نەدارییەکی زۆر سەختەوە. برسێتی خۆی وەلا ناوەو زۆر هەوڵی تێرکردنی منی داوە...

سەرەنجام لای بەرگدروویەکی ئافرەتان کارێکی دەستکەوتووە. بەڵام لەبەرئەوەی من زۆر بچوك بووم نەیتوانیوە زۆر بەرێكو پێکی کاربکات.. ڕەنجی زۆری کێشاوە.

لەم سەروبەندەدا کەسانێکی دڵ نەخۆش هەوڵی بێزار کردنی دایکمیان داوە. لەکاتێکدا ئەو لەبرسێتیو بێ کەسییەکی سەختدا ژیانی گوزەراندووە، هەوڵیانداوە بۆ بەرژەوەندی خۆیان بەکاری بهێنن.

دایکم ژنێکی بێوەژنی گەنجو جوان بووە، لەگەڵ ئەو هەموو ناڕەحەتییەیدا، ناچار بووە ڕووبەڕووی ئەو مرۆڤە چاوبرسیو بێ ڕەوشتانە ببێتەوە.

ئەو کەسانەی کە بە ڕۆژی ڕووناك ڕێگایان پێ دەگرت... ئەوانەی کە خۆیان پێدا هەڵدەواسی.. ئەوانەی کە دەیانویست بیخەنە بازرگانی ئافرەتەوە.... ئەو کەسانەی کەزۆر بەڕاستی داوای هاوسەرگیرییان لێدەکرد... چەندینو چەندینی تر...

دایکم لەبەرامبەر هەموو ئەمانەدا تەنها لەبەر یادگاریو خۆشەویستی باوکم دانی بەخۆیدا گرتووە. ئەگەر نا سەدان جار، هەزاران جار دەیتوانی بگەڕێتەوە بۆ ئیسرائیل. ئەو خۆشەویستیو عەشقە نەبڕاوەیەی لەبەردەم هەموو سەختیو ناڕەحەتییەکدا بۆی بوو بوو بەقەڵغانێکی بەهێز.

—یەکجار بەم شێوەیەش؟

دایکم کە لەکاتێکدا لەلایەکەوە ڕووبەڕووی برسێتیو نەداری بوو بوویەوەو لەلایەکی تریشەوە ڕووبەڕووی چەند مرۆڤێکی نیازپیسو هەوەسباز بوو بوویەوە.

لەم سەروبەندەدا بەڵایەکی بەسەر هاتووە کە هەرگیز بیری لێ نەکردووەتەوە..

لەڕاستیدا منیش وەکو خەیاڵێك ئەو ڕووداوەم بیردێتەوە.

لەو گەڕەکەی کە لێی دەژیاین خاوەنی بیرەخانەیەك، کە پیاوێکی تەمەن مامناوەندی بوو، دەژیا. ئەم پیاوەش دوای مردنی باوکم وازی لەدایکم نەهێناوە... چەندین جار هەواڵی بۆ ناردووەو داوای لێکردووە کە ببێت بە ژنی دووەمی، چەندین جار سەرڕێگای بەدایکم گرتووە... هەروەها خۆیشی چەندین جار هاتووەتەوە پێشو داوای هاوسەرگیری لەدایکم کردووە... بەڵام دایکم هەموو جارێك زۆر بەتوندی ڕەتی کردووەتەوەو زۆر ڕاشکاوانە پێی وتووە کە نایەوێت هاوسەرگیری بکات.

بەڵام ئەو پیاوە دەوڵەمەندو زۆرداربووەو لەهەمان کاتیشدا خەریکی کاری خراپ بووەو پیاوێکی سەریەکۆبەند بووە... دایکیشم لەبەر ئەوەی ژنێکی تەنیاو بێکەس بووەو کەسێکی نەبووە کە پەنای بۆ ببات و پارێزگاری بێت، وەکو بەرخۆلەیەکی بەستەزمان دەستی کردووە بەچاوەڕوانی ئەو بەڵاو نەگبەتییانەی کە بەدەستی ئەم گورگە دڕندانە بەسەری دێت.

خاوەنی بیرەخانەکە، دوای ئەوەی کە دایکم داواکەی ڕەت کردووەتەوە، دەستی کردووە بەجێبەجێ کردنی پیلانە پیسو گڵاوەکەی. هەڵبەت دایکیشم زۆر باش زانیویەتی کە لەڕاستیدا ئەوی وەکو هاوسەرێك

ناوێت، بەڵكو بۆ ڕابواردنێكی چەند ڕۆژی دەیەوێت و دواتریش دەستی لێهەڵدەگرێت...

شەوێك لەگەڵ دوو پیاویدا بەزۆر خۆیان كردووە بەماڵی ئێمەدا... من كاتی ئەو پێك هەڵپرژان و پەلامارە تۆقێنەرەم وەكو خەوێكی تەماوی بیردێتەوە. لەبەر ترس و حەپەساویم، خۆم لەپاڵ دۆڵابە كۆنەكاندا شاردووەتەوەو لەوێوە تەماشای پەلەقاژەو هاوارو ناڵەكانی دایكە داماوەكەمم كردووە، كاتێك كەوتووەتە بەردەستی ئەو گورگە برسی و بێ بەزەییانە، یاخود لەبەر ئەوەی كە دایكم بۆی گێڕاومەتەوە وادەزانم كە بینیومە.

دایكم چەندین سەعات بۆ پاراستنی خۆی بەرگری كردووەو خۆی نەداوەتە دەست ئەو بێ ویژدان و بێ ئابڕووانەوە... هەموو گیانیان خەڵتانی خوێن كردووە... ژنێكی تەنیا لەبەرامبەر سێ پیاو...

هەرچۆنێك بێت خۆی گەیاندووەتە دەرەوەو هاواری كردووە: "ڕزگارم بكەن، هاتوونەتە سەرماڵەكەمان، دەیانەوێت بمانكوژن".

بەدڵنیاییەوە، پیاوەكانیش ڕایانكردووە..

كاتێكیش كە هەواڵی ئەوە بڵاو بووەتەوە كە هەڵیانكوتاوەتە سەر ماڵمان و هەوڵی دەستدرێژی كردنە سەر دایكمیان داوە، خاوەنی بیرەخانەكە وتویەتی: ئێمەی بۆ ماڵەكەی بانگهێشت كردووە، بەڵام داوای پارەی زۆری كردووە، ئێمەش نەمانداوەتێ. لەبەر ئەوە بوو هاواری كردو ناوی ئێمەی زڕاند.

بێگومان، خەڵكیش بڕوا بە كێ دەكەن؟

بڕوا بە بازرگانێكی ناسراوی گەڕەكەكە، كە هەمووان لەكێشەو دەردی سەرییەكانی خۆیان لادەداو، كابرایەك بوو كە بازرگانی بەناموسی

خەڵکەوە دەکرد؟ یان بە ژنێکی تەنیای بێکەس کە لەگەڵ منداڵێکی بچووکدا کەوتبووە ئەو گەڕەکەوە؟ دایکم ژنێکی بێ پاڵپشتو بێ کەسو تەنیا... ئەویش کابرایەکی دەوڵەمەندو بەهێز...

دوای ئەم ڕووداوە کابرا بەم شێوەیە خۆی پەڕاندووەتەوەو خۆی پاکو بێتاوان دەرخستووەو ناوی دایکیشمی زڕاندووەو بە "ژنە خراپەکە" ناوی بردووە... بەداخەوە کە پاش ئەم قسەو باسە ناوبانگی دایکم بەوە لە کەدار کراوە کە ژنێکە نامووسی خۆی بەپارە دەفرۆشێت...

چۆن بەرگەی ئەو بوختانە گەورەو ئەو فێڵو تەڵەکانەی شەیتان دەگریت؟... چەندە سەختە... چەند تۆقێنەرو قێزەونە...

بەداخەوە ئەو کەسەی ئەو تاوانە قێزەونەی بەرامبەر کراوە مەسیحییەو، ئەوانەشی کە ئەم سوکایەتیو بێ شەرمییەیان ئەنجامداوە بەناو موسوڵمانن... بێگومان ئاینی ئیسلام هیچ پەیوەندییەکی بەمەوە نییە. بەڵام ئەنجامدانی خراپەکارییو سوکایەتییەکی وا لەلایەن کەسێکی بەناو موسوڵمانەوە وای لەدایکم کرد کە تووشی یاخی بوون ببێت بەرامبەر بەئایینی ئیسلامو هەروەها بەرامبەر بە موسوڵمانانیش...

دایکم زۆر پەیوەست بووە بەئابڕوو نامووسو هەستی پاکی دایکایەتییەوە، ئەم ڕووداوە بەڕادەیەك کاری تێکردووە کە چەندین جار هەوڵیداوە خۆی بکوژێتو خۆی لەم لەکەیە ڕزگار بکات، چونکە چیتر نەیتوانیوە لەماڵ بچێتە دەرەوە. هەموو کەس بەو چاوەوە سەیریان کردووە کە ژنێکە نامووسی خۆی بەپارە دەفرۆشێت. چەندین مانگ خۆی لەماڵەوە بەند کردووە. بەتەواوی بێچارە بووەو کەوتووەتە گێژاوەوە...

ئەوەندەی کە وەکو خەوێکی تەمومژاوی بیرم بێتەوە، بیرمە ئەوکاتانە دایکم تا بەیانی دەینالاندو بەهاوارو نالەوە فرمێسکی دەڕشت. بەهیچ شێوەیەك بەرگەی ئەم دەستدرێژییەی نەدەگرت. بەگریانەوە دەیوت:

- خوایەگیان تۆ ئەمانە نابینیت؟ لە هەرکوێی وەرەو ڕزگارمان بکە... بێچارە بووین، زۆر لاوازین... کەسێکمان نییە کە دەستمان بگرێت‌و یارمەتیمان بدات...

بەم شێوەیە دەینالاندو خۆی بەدارو دیواردا دەکێشا...

دایکم لەو بارودۆخە سەخت‌و پڕ ئازارەدا چەندین ڕۆژیش برسی بووە... خۆی ئاوی خواردووەتەوەو وردە نانیشی دەرخواردی من داوە...

## خەوێکی زۆر سەیر :

پێم وابێت دایکم لەیەکێك لەو شەوانەدا پیاوێکی زۆر پاك و نوورانی لەخەویدا بینیوە... پیاوەکە پێی وتووە:

- کچم، خەمت نەبێت، تۆ تەنیا نیت... خوای گەورە هیچ بەندەیەکی خۆی بەتەنیا بەجێ ناهێڵێت، ئارام بگرە... پشت بەخوا دەستێکی سۆزو میهرەبانی بۆ تۆش ڕادەکێشێت...

بۆ ڕۆژی دواتر کەسێك لەدەرگای ماڵەکەمانی داوە... دایکم کە دەرگاکەی کردووەتەوە بینیویەتی هەر هەمان ئەو پیاوەیە کە لەخەوەکەیدا بینیویەتی! زۆر حەپەساوە... چۆن حەپەسانێك...! خەریك بووە لەتاودا ببورێتەوە.. پیاوەکە ژنێکی زۆر پاك و نوورانیشی لەگەڵدا بووە...

ئەو پیاوە پیرۆزە هەمان قسەکانی نێو خەونەکەی دایکمی دووبارە کردووەتەوە.

وتوویەتی: کچم، خەفەت مەخۆ، خەمت نەبێت ... خوای گەورە هەمیشە لایەنگری بێکەسانو ستەملێکراوانە... ئەو مرۆڤە خراپانەی کە خاوەنی ڕۆحێکی نەمرووود ئاسان، ئەوانەی کە خراپەیان بەرامبەر بە تۆ کرد، هیچ پەیوەندییەکیان بە ئیسلامو موسوڵمانێتییەوە نییە. تەنها بە ناو موسوڵمانانو هیچی تر... ئەوانە هەر زوو بەسزای خۆیان دەگەن. خوای گەورە هیچ بەندەیەکی ستەملێکراو بەجێ ناهێڵێت.

پاشان زەرفێکی داوە بەدایکم.

دایکم وتوویەتی: ئێوە کێن؟

ئەو پیاوە نوورانیەش وتوویەتی: بەندەیەکی خوام، من مەلای ئەم گەڕەکەم، ئەمەش خێزانمە، بەڵام ئاممان لای هیچ کەس نەڵێیت کە ئێمە سەردانی ئێوەمان کردووە. ئێمە هەوڵ دەدەین ناو بەناو سەردانتان بکەین. بەمە دەتوانن پێویستییەکانی ئێستاتان دەستەبەر بکەن.

ئەو دوو مرۆڤەی کە وەکو خەیاڵێك هاتوون، هەروەکو خەیاڵیش لەبەرچاو ون بوون.

دایکم لەبەرامبەر ئەم بارودۆخە پڕ نهێنییەدا سەری سوڕماوەو لەهەمان کاتیشدا ئەو دیدو بۆچوونە سلبی و خراپەی کە بەرامبەر موسوڵمانان هەیبووە گۆڕاوە.

دایکم کە زەرفەکەی کردووەتەوە بینیویەتی بڕێك پارەیە... بەو پارەیە پێویستییەکانی کڕیوەو کرێ کەڵەکە بووەکەی خانووەکەشی داوە، بەڵام چیتر نەیتوانیوە بچێتە دەرەوە. هەرچەندە بێتاوانیش بووە، بەڵام نەیتوانیوە سەیری دەمو چاوی کەس بکات. چونکە خەڵکی گەڕەکەکە وەکو ئافرەتێکی لەش فرۆش سەیریان کردووە.

پاش ئەم ڕووداوە دایکم باری دەروونی بەتەواوی تێکچووە، بەجۆرێك کە زوو زوو بووراوەتەوەو لەهۆش خۆی چووە. کە دواتریش ئەم دۆخەی هەر بەردەوام بووەو تابێت زیادی کردووە. منیش ئەو ماوەیەم زۆر باش لەبیرە...

## تۆڵەیەکی لەو جۆرە :

هەموو شتێك دوای هاتنی ئەو پیاوە نوورانیە ڕووی داوە... ماوەیەکی زۆر بەسەر ڕووداوەکەدا تێپەڕیوە..

خاوەنی بیرەخانەکە کە لەگەڵ چەند پیاوێکیدا هەڵیکوتایە سەر ماڵمان تووشی ڕووداوی هاتووچۆ بووەو کەوتووەتە ژێر ئۆتۆمبیلەکەیەوە، بەوهۆیەوە تووشی ئیفلیجی بووە... لەو ماوە دوورو درێژەی کە لەسەر جێگا کەوتووە چەندین جار هەواڵی بۆ دایکم ناردووەو داوای گەردن ئازادی کردووە...

ئەگەر دایکیشم گەردنی ئازاد بکردایە، ئایا خوای گەورە لێی خۆش دەبوو؟ ئەی ئەو دڵە بریندارەی دایکم سارێژ دەبوو؟ دایکم گەردنی ئازاد کردووە... بەڵام ئەو چەندین ساڵ لەسەر جێگا کەوتووە، سەرو بنی خۆی پیس کردووەو، نەمردووە، بێگومان خوای گەورە ئەو ستەمکارەی هێشتووەتەوە، تا ببێت بە پەندو ئامۆژگاری.. ئەی خوای گەورە... تەنها خۆت خاوەن تواناو دەسەڵاتی ڕەهایت. هەڵبەت تۆڵە سەندنەوەی خوای گەورە وەکو تۆڵە سەندنەوەی مرۆڤەکان نییە، کە سەندنیەوە بەتەواوی دەیسێنێتەوە.

یارمەتیدانی مامۆستاو مەلای بەڕێزی گەڕەکەکەو بەسزا گەیشتنی ئەو پیاوە خراپەی کە ئابڕوو ناموسی دایکمی لەکەدار کرد، کاریگەرییەکی زۆر

قولّیان لەسەر دایکم بەجێ هێشتووە. ئەو ڕووداوە پڕنهێنییانە ڕق و تووڕەیی دایکمیان بەرامبەر بەموسوڵمانان سڕیوەتەوەو نەهێشتووە.

دایکم خەریك بوو وردە وردە بەرەو باشی دەچوو، لەکاتێکدا کە زۆرێك لەشتەکان خەریك بوون دەکەوتنە سەر باری ئاسایی خۆیان، دیسانەوە بەڵاو نەگبەتی ڕوویان تێکردینەوە... من ئەوکاتە تەمەنم چوار ساڵ بوو. ڕووداوەکانم زۆر بەباشی بیر دێتەوە.

تەنها پشتیوانێکمان هەبوو لەو شوێنەی کە لێی دەژیاین، ئەوانیش مەلای بەڕێزو خێزانەکەی بوون...

ئەوەندەمان یارمەتی لەو دوو مرۆڤە بەڕێزەوە پێدەگەیشت کە هەرگیز لە باسکردن نایەت... وەکو ئەندامی خێزانەکەی خۆیان یارمەتییان دەداین و دەیان پاراستین، لەهەموو کێشەیەکماندا بەهانامانەوە دەهاتن، بەڵام بەجۆرێك کە نەیاندەهێشت هیچ کەس بیانبینێت و پێیان بزانێت... هەرچەندە مامۆستاو خێزانەکەی زۆر بەوریایی و خۆپارێزییەوە مامەڵەیان دەکرد، بەڵام بەداخەوە ئەو ناو زڕانەی دایکم و ناو دەرکردنی بە "ژنە خراپەکە" کاری لەچارەنوسی مامۆستای بەڕێزیش کردبوو.

لەبەرئەوەی مامۆستای مزگەوتەکە زوو زوو دەهاتە ماڵمان و دەڕۆی، لەگەڕەکەکەدا وا دەنگی دابویەوە. گوایە مامۆستا لەبەر دایکم هاتوچۆی کردوین... بوختانێکی لەو جۆرە.. دۆستێکی پەروەردگاریان بە بوختانێکی لەو جۆرە لەکەدار کرد. سەرەڕای ئەوەی پیاوەکە زاتێك بوو وەکو وەلی.

چەند گوناهە مامۆستایان نەفی کردو لەوێ دووریان خستەوە... دایکم زۆر بەوە بێتاقەت بوو بوو. چەندین ڕۆژ گریا، دەیوت: ئەمانە چین بەسەرماندا دێن؟...

ئـەو کەسـانەی کـە دیـوی نـاوەوەی ڕووداوەکـەیان نـەدەزانی، وایـان دەزانی مامۆستا بە نیەتێکی خراپ هاتوچۆی دایکمی کـردووە، لەبـەر ئـەو هۆیە، زۆر خراپەکاریان کرد بەرامبـەر ئـەو دۆسـتەی پـەروەردگار کـە وەك ئەولیا بوو، لەبەردەمی خەڵکیدا بچووکیان کـردەوە. ئـەو مرۆڤـە بـەڕێزە، بەشداری هەموو فیداکاریەکی دەکرد بۆ یارمەتیـدانی بەندەیـەکی خـوا کـە بەتەنهاو بێچارە مابویەوە بەخۆشەویستی و مەرحەمەتەوە، بووە قوربـانی بوختانێکی زۆر ناشیرین.

مامۆستای دامـاو کـەوتبووە حاڵـەتێکی ئەوەنـدە نارەحەتـەوە شـەوێك ماڵەکەی بارکردبوو ڕۆیشتبوو.

دوای ئەوەی مامۆستا ڕۆیشت، ئارامی ئێمەش سەرتاپا تێکچوو. لـەناو ئەوەی کە دەمانوت لەوانەیە هـەر هێرشـێك بکرێتـە سـەر دایکم، تەنانـەت بەڕۆژیشـا دەرگاکـەمان کلیـل دەداو بـەو جـۆرە دادەنیشـتین. ئێسـتا بیردەکەمەوە چەند حاڵێکی قورسە.

بیربکەنەوە... ژنێکی گەنج، بەتەنها، لەسەرو ئەوەش لەگەڵ منـداڵێکی بچـووکدا... بـەجیا لـەوەش دینـی جیـاواز... مەملەکەتەکـەی جیـاواز... ئەوەی کە وای لێکردبوو لەوێدا بمێنێتـەوەو ئـەو هێـزەی وایلێکردبـوو کـە ملکەچ بکات بەرامبەر ئەم بارودۆخە تەحەمولنەکراوانە، ئەو عەشـقەی بـوو کە هەیبوو بەرامبەر بـاوکم و ویسـتی بـە تـەنها جـێ نەهێشـتنی بـوو. ئـەم خۆشەویستییە چەند پەیوەندییەکی بێوێنەی دروستکردووە کە بۆ ئـەوەی ئەو خاکە جێنەهێڵێ کە باوکمی تێدایـە، خەریکـە تەحـەمولی ئەشـکەنجەی وەحشیەکان دەکات.

وابیری دەکردەوە کە ئەگەر ئـەو خاکـە بـەجێبهێڵێت ئیهانـەی بـاوکمی کردووە. هەرچەندە هەرکاتێك بیویستایە دەیتـوانی تورکیـا بـەجێبهێڵێت و

بگەڕێتـــەوە ئیســـرائیل، دەیتـــوانی ڕزگـــاری ببێـــت لـــەو ڕووداوە بـــێ بەرەکەتانـەی کـە ژیـانی گۆڕیبـوو بـۆ دۆزەخ. بـەڵام بـەهۆی ئـەو عەشـقە گەورەیـەی کـە خـەڵکانی ئـەو ڕۆژگـارە زۆر بـە قـورس تێیدەگـەن ئەمـەی نەکرد. باوەشی کرد بەو خاکەی بـاوکمی تێدا ڕاکشـابوو، برسـێتی ڕۆحـی لەوێدا کـەم کـردەوەو هێـزی کۆکردەوە بـۆ ئـەو دونیـا بێچـارەیەی. ئـەی دایکی خۆم کە ڕۆژت نەبینیوە:

چۆن خۆت ڕاگرت، چۆن تەحەمولت کـرد، چـۆن لەسـەر پـێ مایتـەوە، بەرامبەر ئەم هەموو ئازارو دڵەڕاوکێ و ناڕەحەتیانە؟

## خەڵکی گەڕەکەکە دایان بەسەر ماڵەکەماندا :

ئازارەکانمـان تـەواو نـەدەبوون، زریانـەکانی فەلاکـەت بەسـەرمانەوە نەدەگیرسـایەوە، بیرکردنـەوەی بێزاریمـان تـا بێـت زیـاتر لـە تاریکـایی بێکۆتادا دەناشت.

فەلاکەتی سەرەکی کە هەموو نەهامەتیەکانمانی لەدواوە جێهێشت نزیك نەبوویـەوە. هـەم فەلاکـەتێك کـە بـە شـێوەیەك خوێنمـانی دەبەسـت، مێشکمانی تێك دەدا..

خەڵکی بێ ویژدان و لەخوا نەترسەکانی گەڕەکەکەمان بـەردەوام بـوون لە زیادکردنی بوختانەکان دەربارەی دایکم. گوایە دایکم بووە بە ئافرەتێك ژیان و نامووسی بە پارە دەفرۆشێت.

ئاخ! بەس دایکمتان بناسیایە، وەکو موسوڵمانێکی موخلیص، ژیانێکی زۆر پاکی بەسەر دەبرد. خاوەنی بیرکردنەوەی پرشـنگداربوو... هـەرگیزاو هـەرگیز خـودی خـۆی پـیس نـەکرد. بـەڵام وەرەو ببینـە ئـەم تـەنهایی و

بێکەسیەی ئیشتیهای ئەم گورگە برسیانەی زیادکردو بووە هۆکاری ئەوەی سەردەرکەن لە ڕێگایەکی بەم جۆرە.

لەکۆتایدا هەندێك لە خەڵکی گەڕەکەکە کە نیەتیان پیس بوو دایان بەسەر ماڵەکەماندا. هەموو کەلوپەلەکانمانیان تێکوپێکدا.

بە قژ دایکی داوامیان گرت و ڕایاندەکێشا. چەند خراپەیان کرد... چەند ئەشکەنجەی تەحەمول نەکراویان داین. چیان کرد خوایە گیان، چی چی... تەنانەت بیرکردنەوە لەو دیمەنانە پشکۆیەك هەڵدەداتە ناخمەوەو ئاگر لەناخم بەردەدات.

دایکم نەیتوانی زیاتر تەحەمولی ئەم پەلامارە بێوێژدانانەو ئەم بێ ئەخلاقیانەو ئەم پەلامارە لە ئینسان بەدەریانە بکات، بورایەوەو کەوتە سەر زەوی... هەموو لایەکی لەناو خوێندا بوو. من بە هاوار کەوتم بەسەر دایکمدا. بەو دڵە منداڵانەیەمەوە لەترسا لەرزە لەرز دەلەرزیم و نەمدەزانی چی بکەم. وام دەزانی ئەو مردووە.

ئامان پەروەردگارم کە بیری ئەو فەلاکەتەم دەکەوێتەوە ئێستەش لەرز دام دەگرێ و ناخم دادەڕمێنێ.

مرۆڤەکان چەندە بێ بەزەیی و چەندە بێڕەحمن بەو جۆرە.. بە تەنها بوختانێکی بێ بنەماو بەبێ لێکۆڵینەوەو پرسیارکردن چۆن ئەمە دەکەن؟ شتێك نیە باوەڕیشی پێ بکرێت.

پۆلیس هاتنە ماڵەکەمان و دایکی داماومیان لەژێر دەستی گەڕەکەکە دەرهێنا. وانەبوایە لەوێدا دایکمیان دوور لە هیچ یاسایەك دەکوشت.

دایکم ڕێك وەکو قوربانیەك بوو. سەری بریندار بوو بوو، دەستەکانی پارچە پارچە بوو بوون، شوێنێك لەلەشیدا نەمابوو کە زەربەی

بەرنەکەوتبێت. لە لێوە تەقیوەکانیشی و ددانە شکاوەکانیەوە خوێن دەچۆڕاو بە چەناگەیدا نەدەوەستاو دەهاتە خوارەوە.

یەکێك لە پۆلیسەکان خۆی نەگرت، دەستی کرد بە قسە وتن بە خەڵکی گەڕەکەکە: هاواری کردو وتی: ئێوە چ جۆرە موسوڵمانێکن. ئەگەر کەسێك تاوانباریش بێت ئێوە ناتوانن سزای بدەن. ئەم ئیشە تایبەتە بە دەوڵەت. گەورەترین تاوان ئێوە ئەنجامی دەدەن. هەندێك کەسی نیەت پیس ئێوە هان دەدەن، ئێوەش دێن ئەم مرۆڤە گوناحانە، بیرتان نەچێت دادگای خوای گەورە هەیە.

هەموو ئەم کەسانەی کە لەناو ئەم قەرەباڵغییەدان هەر لە ژیانیدا دەبێت باجی ئەوەی کردویەتی بیداتەوە.

پۆلیسەکان ئێمەیان هەڵگرت، بردیانین بۆ سجن.. ئیتر ئێمە نەماندەتوانی لەو خانوەدا بمێنینەوە. ئێمەش ئەمەمان دەزانی، پۆلیسەکانیش دەیانزانی و خەڵکی گەڕەکەکەش...

پۆلیسەکان، بۆ ئەوەی ڕووبەڕووی کێشەیەکی لەمە گەورەتر نەبنەوە ئێمەیان سواری پاسێك کردوو ناردیانین.

# بەشی دووەم

## دایك و كچ لەناوەڕاستی ڕێگەدا جێهێڵرابووین

### پوختەی ئەم بەشە

دوای مردنی باوكم، كەسی زۆر جوان و خاوەن پایە بەردەوام خوازبێنیان لەدایكم دەكرد بۆ هاوسەرگیری.

بەڵام ئەو لەبەر ئەو خۆشەویستییەی كە بۆ باوكم هەیبوو، دانی بەخۆیدا دەگرت.. بەڵام ئێمە ئیتر لەم شارە دەردەكراین، باشە دەبوو بچینە لای كێ؟ كێمان هەبوو بمانگرێتە خۆی؟

## نەماندەزانی بۆ کوێ دەڕۆین

دایکم هەموو گیانی برین بوو و، منیش هێشتا لەشۆکی ئەو ڕووداوانەدا بووم کە بەسەرماندا هاتبوون! بە جانتایەکی دەستمانەوە کەوتینەڕێ.

بۆ کوێ دەڕۆین؟ لەلای کێ دەمێنینەوە، نازانین... بەپەلە ئەو شارەمان بەجێ هێشت بەڵام بۆ کوێ؟

لەوپەڕی بێچارەییدابن، کاتێك پاسەکە لە وێستگە داماندەبەزێنێت چیمان لێ بەسەردێت؟! بۆلای کێ دەڕۆین؟!

دایکی بێ چارەم بەردەوام فرمێسکی دەڕشت، چونکە دەیزانی هیچ ڕێگایەکی دەربازبوون لەم حاڵەتە نیە.

– یارمەتیمان بدە خوایەگیان، زۆر بێچارە ماوین، جگە لە تۆ هیچ کەسمان نییە.

یان بەڕێزەوە بمانژێنە، یان مردنێکی شەرەفمەندانەمان پێ ببەخشە، ڕەنگە زیاد لە دە جار گوێم لەم دوعایە بووبێت کە دایکم دەیخوێند.

خۆرکەوت و پاسەکە لەشوێنێك وەستا، من زۆرم برسی بوو، بەڵام گیرفانمان فلسی تیانەبوو تا خواردنی پێ بکڕین. هاوارم دەکرد "من برسیمە" بێ هەواڵ لەبێ پارەییو نەبوونی... دایکی بێ چارەم دەیوت:

– کچم دوای کەمێکی تر ئەم سەفەرە تەواو دەبێت، ئەوکات خۆمان تێر دەکەین.

دایکم دەیویست بەم قسانە سەرقاڵم بکات، فرمێسك بەچاوەکانیدا بێ وەستان دەهاتنە خوارەوە.

لەبەرامبەر هاواری "برسیمە" "برسیمە" ی مندا، خاتونێکی بەتەمەن هاتە تەنیشت دایکمەوە کە بەهۆی منەوە هەراسان بوو.. بە میهرەبانیەوە دەستی هێنا بەسەرمداو وتی:

—ئەم کچە جوانە بۆچی دەگری؟

پێش ئەوەی دایکم وەڵام بداتەوە، من وتم:

—برسیمە... کەچی دایکم سەموونم بۆ ناکرێت.

ئەو هەڵسوکەوتە بەریئانەیەی من کاری کردە سەر خانمە بەتەمەنەکە باوەشی پیاکردمو ماچی کردمو یەکسەر لەناو عەلاگەکەی دەستی دا بۆرەکێکی دەرهێناو دایە دەستم، هەرچەندە دایکم ویستی بەرهەڵستی بکات، بەڵام خانمەکە نەیهێشت.. وتی:

— ئەمانە منداڵن، منداڵ هەروایە هەموو دەقەیەك برسی دەبێت... ئەمەی وتو بۆرەکێکیشی دا بەدایکم و وتی:

—فەرموو، باوەڕ بکە بە دەستەکانی خۆم دروستم کردووە، تامێکی بکە بزانە چۆن دەرچووە؟!

زۆرم پێ خۆش بوو کاتێك بینیم دایکیشم وەری گرت، هیچ نەبێ ئەویش سکی خۆی پێ تێر دەکرد، بەڵام بینیم دایکی بێچارەم بەهێواشی گازێکی بچوکی لەبۆرەکەکە گرتو پارچەکەی تری خستە ناو جانتاکەی دەستیەوە، دڵی دایك وایە... ئەو زیاتر بیری لە من دەکردەوە وەك لەبرسێتی خۆی...

دایکم و خانمە بەتەمەنەکە بەسەر پێوە خۆیان بەیەکتر ناساند، ئەو بۆ ئەو شارەی کە ئێمە بۆی هاتبووین، بۆ زیارەتی خزمێکیان هـاتبوو بـەنیاز بوو دووبارە بگەڕێتەوە شوێنەکەی خۆی.

ئەو مێردەکەی لەتەمەنی زۆر گەنجێتییەوە لەدەست دابـوو، دواتـریش شووی نەکردبووەوە، تـەنها کچێکی هـەبوو ئـەویش لـە شـوێنێك پزیشـك بوو...

ئەم خانمە بەتەمەنە دەوڵەمەند بوو، بەڵام بەتەنیا دەژیا.

دایکیشم باسی خۆی کرد، بەڵام لـە ترسـی قسـەو قسـەڵۆك نـەیوت کـە دەرکـراوین: تـەنها باسـی ئـەوەی کـرد کـە مێردەکـەی مـردووەو لەگـەڵ کچەکەیدا دەژیو بۆ دۆزینەوەی کار هاتوەتە ئێرە.

خانمەکە وەك ئەوەی شتێکی دۆزیبێتەوە کە ساڵانێك بەدوایـدا گـەڕاوە وتی:

—ئەی خوایە چەند ڕێکەوتێکی جوانە... بەخۆشییەکەوە هاواری کـرد، خـوا ئاگـادارە یەکـەم جـار کـە ئێـوەم بینـی چـوونە دڵمـەوە، منـیش بـۆ هاوڕێیەك دەگـەڕام، هەرچـەندە کچـەکەم زۆر حـەز دەکـات بـڕۆم بـۆ لای، بەڵام من نامەوێت ببمە ئەرك بۆی، هەندێك خزمەتکاریشم هێنایە لای خۆم، بـەڵام ئـەوانیش بـێ وەفـا دەرچـوون. سـەیرکە تـۆش خـاوەن منـداڵێکی بچـوکی: هاوسەرەکەشـت لەدەسـتداوە، ئەگـەر دەتـەوێت وەرە لای مـن پێکەوە ژیان بەسەر دەبەین.

ئـەی خوایـە گیـان!! ئـەی پـەروەدگاری باڵادەسـت!! ئەمـە چ موژدەیەکی گەورەیە، ئەمە موعجیزەیە، وەك چاکبوونەوەی نەخۆشێك کـە لەسەرەمەرگدایە، یان وەك ڕزگاربوونی کەسێك کە خەریکـە لـە برسـێتی و تینوێتیـدا دەمرێـت... پـێم وایـە ڕزگـارکردنی پـەروەردگار بـۆ بەنـدە بـێ

تـاوان‌و بـێ گوناهه‌کانـه‌و لـه‌م ڕووداوانـه‌ش جـوانتر ده‌سـت ناکـه‌وێت بـۆ پێناسه‌کردنیان، چه‌ند ڕووداوگه‌لێکی پڕ لـه نهێـنین.. پـڕ لـه عیبره‌ت کـه مرۆڤه‌کان سه‌راسیمه ده‌که‌ن.

ئای دایه‌گیان ئای... خه‌ریك بوو له‌خۆشیدا ده‌فڕی... دایکم لـه‌نێو بـێ چـاره‌بییه‌کی ئه‌وه‌نـده گـه‌وره‌دابوو، تـه‌کلیفێکی لـه‌و جـۆره و لـه‌م کاتـه‌دا به‌خششێکی زۆر دیاری په‌روه‌ردگار بوو.

دایکم نه‌یتوانی به‌رگه‌ی ئـه‌م خۆشـییه بگـرێ، بۆیـه لـه شـوێنی خـۆی دانیشت‌و ده‌سته‌کانی گرت به ده‌م‌و چاویه‌وه‌و ده‌ستی به گریان کرد.

وای له‌و فرمێسکانه.. دایکم تا ئـه‌و سـاته‌ش فرمێسـکی زۆری ڕشـتبوو به‌ڵام ئه‌مه‌یان لـه‌وانی دی زۆر جیـاوازتر، ئـه‌م جاره‌یـان لـه‌و چـاوانه‌ی کـه جیاوازتر له ڕۆژانی دی ده‌یـانڕوانی فرمێسـکی شـادی ده‌هاتنـه خـواره‌وه. که‌سێك له‌مانه تێده‌گات که خۆی ئـه‌و ئـازاره‌ی چه‌شـتبێت. دایکـم کـه بـه ئـاگری ئـه‌و هـه‌موو نائومێدییـه‌وه سـووتابوو، وه‌ك ئـه‌وه‌ی ده‌سـتێکی ئه‌فسـوناوی به‌رکـه‌وتبێت لـه ناکـاو ژیایـه‌وه، لێـوه وشـکهه‌ڵاتوه‌کانی پاراوبوونه‌وه‌و چاوه‌کانی گه‌شانه‌وه.

## بۆ یه‌که‌مجار ئومێدێك سه‌ری هه‌ڵدا :

دایکـم خـۆی وه‌ك مه‌سـیحییه‌ك نه‌ناسـاندبوو، بـۆ بـه‌ره‌نگار بونـه‌وه‌ی پێشینه بڕیاری خه‌ڵکیش هه‌م ناوی من‌و هه‌م ناوی خۆشی گـۆڕی... نـاوی دایکم بوو به مه‌ریه‌م ناوی منیش به (جانان)...

چیتر ناچاربووین له‌م کۆمه‌ڵگه‌یدا به پێناسی موسوڵمانیه‌وه بژین.

به‌ڵام دایکم نه مه‌سیحییه‌کی ته‌واو نه یه‌هودیـه‌کی تـه‌واو بـوو، بـه‌هۆی باوکمه‌وه هه‌ستێکی قووڵی سه‌باره‌ت بـه موسـوڵمانێتی هـه‌بوو، ئه‌گه‌رچـی

ئـەو ڕووداوانـەی بەسـەرماندا هـات دایکمـی لـە موسـوڵمانێتی سـارد کردبێتیشـەوە، عەشـق و خۆشەویسـتی بـاوکم هەمیشـە پێـداگری دەکـرد هەرچەندە بەموسوڵمانیش ناسرابووین، بەڵام دایکم ناوبەناو باسـی دینـی مەسیحی بۆ دەکردم، منـیش لەمنداڵیـەوە بەسـۆزی مەسـیحییەوە گـەورە بـووم، بـەڵام دژی موسـوڵمانێتیش قسـەمان نـەدەکرد... ئـەو پـوورە (نورەفشان)ەی ئێمەی گرتبووە خـۆی خـانمێکی دینـداربوو زۆر بـاش بـوو لەگەڵماندا، وەك منداڵی خۆی مامەڵەی لەگەڵ دەکردین.

دایکم لەدوای لەدەستدانی باوکم بۆیەکەم جار کەوتبووە ئیسراحەتێکی لەو جۆرەوە، ماڵەکـەشمان ئیشـێکی وای نـەبوو، خـاوێن کردنـەوەی مـاڵ، خواردن، کۆمەڵێك پێویستی ماڵ کە ڕۆژانە دەبوایە بیان کڕین، بەواتایەکی تر ئێمە تەنها هاوڕێیەتی خانمە بەتەمەنەکەمان دەکرد.

## جەژنی دایکم:

پـوورە (نورەفشـان) ژیـانێکی مـاددیو مەعنـەوی پـێ بەخشـی بـووین نزیکەی دووساڵ لەماڵیاندا ماینەوە، تەمەنی من بووبووە شـەش سـاڵ ئـەو دووساڵە خۆشترینو بەختەوەرترین ساڵی ژیانم بوون.

پوورە (نورەفشان) وەك چاوی خۆی دەی پاراستین، ژیانێکی تری پێ بەخشی بووینو وەك منداڵی خۆی چاودێری دەکردین. ئێمە چیتر لە ئازارو نەهامـەتی کـە دوورکەوتبووینـەوە. پێشـینە بڕیـاری دایکـم سـەبارەت بەموسـوڵمانان بەتـەواوی نـەمابوو، پـوورە (نورەفشـان) خـانمێکی زۆر دینـداربوو، هـەم بـەهۆی هەڵسـوکەوتەکانیەوە هـەم بـەهۆی قسـەکانیەوە بووبووە موسوڵمانێکی نموونەییو ئەمـەش کاریگـەری زۆری لەسـەر دایکـم هەبوو.

–دایکم دەیوت ..ئاه خۆزگە هەموو موسوڵمانێك وەك ئەم خانمە وابوایە، ئەوکاتە هیچ ستەم و خراپەیەك لە دونیادا نەدەما.

لەلایەکی تریشەوە پوورە (نورەفشان) دراوسێیەکی فریشتە ئاسای هەبوو ناوی خاتوو (ئەلیف) بوو، ئەو مرۆڤێکی زۆر تێگەیشتوو بوو هەرچەندە تەمەنی لە پوورە (نورەفشان)یش کەمتربوو، بەڵام کاتێك دەهاتە لامان پوورە (نورەفشان) زۆر رێزی لێ دەگرت، لەگەڵ ئەوەی (ئەلیف) خاتوون تەمەنیشی بچووك بوو، بەڵام زانست و زانیاری زۆری پێ بوو. هەموو رۆژانی هەینییەك دەهات بۆماڵمان لەگەڵ پوورە (نورەفشان) قورئانیان دەخوێندو بابەتی دینی زۆر خۆشیان باس دەکرد، ئەو دانیشتنانە کاریگەرییەکی زۆریان هەبوو لەسەر دایکم، هەربۆیە بەبێ ئارامییەوە چاوەڕوانی رۆژانی هەینیو ئەو دانیشتنانەی دەکرد، چونکە سوودێکی زۆری لێ دەبینیو لەو رۆژەدا فرمێسکی شادی لەچاوانی دەهاتە خوارەوە.

دایکم لەو رۆژانەدا خەونێکی بەباوکمەوە بینیبوو.

باوکم لەخەونیدا وتبووی – من بەئاسوودەییەکی زۆرەوە چاودێری ئێوە دەکەم مەراقی تۆ بۆ موسوڵمانێتی منی زۆر دڵخۆش کردووە، ئەگەر بەموسوڵمانی بۆلای من بگەڕێیتەوە وەك ئەوە وایە گەورەترین دیاریت بە من بەخشی بێت، تەمەن زۆر کورتە، پێش ئەوەی تەمەنت کۆتایی بێت موسوڵمان ببە.

ببە بە موسوڵمان تا منیش لێرە ئاسوودەبم، کچەکەشمان فێری ئیسلامەتی بکە، بۆ ئەوەی کە گەورەبوو بەڕێگەی هەڵەدا نەڕوات دایکم کاتێك بەخەبەرهات ماوەیەك لەشۆکی خەونەکەیدا مابووەوە هەرچەند ئەو

ژینگە ڕۆحانیەی ماڵەوەش دایکمی هەنگاو بەهەنگاو زیاتر لەموسوڵمانێتی نزیکتر دەکردەوە.

پوورە (نورەفشان) و (ئەلیف) خاتوونیش نەیاندەزانی کە ئێمە لەسەر دینێکی ترین ئەوان ئێمەیان بە موسوڵمان دەزانی.

هەرگیز ئەو بەیانیەم لەبیرناچێتەوە.

هەردووکمان خۆمان شت و، جلی خاوێنمان لەبەرکرد و بەرماڵمان داخست و، بۆ یەکەمجار ڕوومان کردە پەروەردگار و دەستی شەهادەت و پاڕانەوەمان بەرزکردەوە.

دایکم وتی:

–کچم ئێمە دەبینە موسوڵمان، باوکت ئەمەی دەوێت، باوکت ئێمە دەبینێتو دەزانێت چی دەکەین، ئەگەر ئێمە موسوڵمان ببین باوکت زۆر دڵخۆش دەبێت.

دایکم لەبەرامبەر باوکمدا ئەوەندە هەستێکی بەهێز و مۆگریەکی سەرسوڕهێنەری هەبوو، هەرگیز ناتوانم باسی بکەم. کاتێك ناوی باوکم بهاتایە، لەچاوە جوانەکانیەوە هۆن هۆن فرمێسك بەسەر ڕوومەتیدا دەهاتنە خوارێ.

کچ و دایك پێکەوە لە هەمان جۆشو خرۆشدا و بەکوڵ بۆ شەهادەتهێنان چۆکمان دادابوو، دایکم وتی:

–کچی خۆم بەهیچ کەس مەڵێ کە ئێمە موسوڵمان بووین، چونکە هەموو وا دەزانن ئێمە موسوڵمانین.

دەستەکانمان بەرز کردبووەوە، دایکم دەیوت و من دووبارەم دەکردەوە لەبەردەم سوڵتانو خودای کائینات، لەبەردەم خۆشەویستی مەخلوقاتدا شەهادەتمان هێنا.

دایکم بەگریانەوە چووە سوجدەوەو بەسەعات دەپاڕایەوە

-خوایە گیان... تاکۆتایی تەمەنمان لەخۆتمان دوور مەخەرەوە دایکم لەناخەوە بوویووە موسولمان.. دەیوت:

-کچم ئەمە جەژنی من بوو، من لەبەر ئەوەی باوکتم دڵخۆش کرد زۆر ئاسوودەم، لەبەر ئەوەی بەموسولمانێتیش دەگەڕێمەوە لای باوکت، دڵخۆشیەکەم بێ سنوورە...

ئای لەو جۆرە عەشقانە... ئای لەو جۆرە وابەستەییانە، ئەم عیشقە بۆ دونیا، بۆ پارە، بۆ ئارەزووەکانی تر نییە، هەروەها خۆشویستنی جەستەو بالاو سەرسام بوون بە ڕووکەشیش نییە.

ئەمە عەشقی ڕاستەقینەیە، ئەمە عاشق بوونە بەڕۆح بە کەسێتی..

ئەمە بەیەکگەیشتنی دوو جەستەو، تێکەڵ بوونی دوو ڕۆح و داگیرسانی دوو دڵە وەك چرایەك... ئێستا کوا عەشقی لەو جۆرە ماوە!!!

شەرم دەکەم کاتێك دوو کەس دەبینم کە عەشقەکەیان بەیانی دەست پێ دەکات و ئێوارە کۆتایی پێ دێت، بەلامەوە سەیرە کاتێك دەبیستم لەساڵێکدا دووکەس هاوسەرگیرییان کردووەو لەهەمان ساڵدا هاوسەرگیرییەکەیان تێکچووە. ئەمانە عەشق نین ئەمانە یارییەکانی مەصلەحەتن... ئەمانە داوەکانی نەفسن..

دایکم بەئاسوودەییەکی زۆر گەیشتبوو، نوێژەکانی لەسەرەتاوە تا کۆتایی بەخشوعێکی زۆرەوە دەکردن.

بەماوەیەکی کەم فێری خوێندنەوەی قورئان بوو، هەموو شەوێك سورەتی (یس)ی بۆ باوکم دەخوێند ئینجا دەنووست.

# بەشی سێیەم

## ڕۆژە سەختەکان چاومرێیان دەکردین

**پوختەی ئەم بەشە**

ئـــەو شـــنەبا بەهاریيـــەی لـــە دڵمانـــدا دەشـــنايەوە، گـۆڕا بـە گـەردەلوول و زريـانی بـــەفر. ڕۆژە ســـەختەكان هـــاتن و جێيـــان گرتنەوە.

# دڵخۆشیەکەمان زۆری نەخایاند

بەداخەوە ئەو ڕۆژانەی کە بۆ یەکەم جار تیایاندا هاتبووینەوە سەر خۆمان و لەشوێنێکی باش ئۆقرەمان گرتبوو و بۆ یەکەم جار بەتێری لەسەر سفرە هەڵدەساین، زۆریان نەخایاند پووره (نورەفشان) نەخۆش کەوت، کچەکەی هاتو لەگەڵ خۆی بردی بۆ ماوەیەکی زۆر چارەسەی وەرگرت، بەڵام بەداخەوە نەخۆشییەکەی بەردەوام بوو، وەفاتی ئەو واتای سەروژێربوونی ژیانی ئێمەبوو، بەمانایەکی تر گەڕانەوەمان بوو بۆ خاڵی سەرەتا، هەموو ئەو خۆشیانەی لە ماوەی ئەو دووساڵەدا بینیومانە دەبوونە خەیاڵ لەبەرئەوە دایکم شەووڕۆژ دوعای دەکردو دەپاڕایەوە.

نەخۆشیەکەی پووره (نورەفشان) تادەهات خراپتردەبوو، تەنانەت بۆ دەقیقەیەکیش بەجێمان نەدەهێشت، خاتوو ئەلیفی دراوسێیشی لەگەڵماندابوو.

ئەو ڕۆژەم زۆر جوان لەیادە، شەوی پێنج شەممە لەسەر هەینی بوو، پووره ئەلیفو دایکم لەلای بوون، منیش بەترسەوە لەو ناوە دەسوڕامەوە.. لەجێگەکەی بەرز بویەوە وتی:

بەرزم بکەنەوە، بەرزیان کردەوە

—خێرا بمشۆن.

دایکمو و ئەلیف شۆردیانو هێنایانەوەو لەجێگاکەی خۆیدا پاڵیان خست. دووبارە بەرز بویەوەو لەسەر چۆک دانیشتو وتی:

–قورئانی پیرۆزم بدەنێ:

قورئانەکەی گرت بەدەستیەوەو دەستی بەخوێندەوەی کرد و ئەلیف خاتوونیش لای سەریەوە قورئانی دەخوێند.

لەناکاو قورئانەکەی دەستی داخست. چاوەکانی بڕییە دەرگاکە و زەردەخەنەیەکی شیرین لەسەر دەمو چاوی دەرکەوت و وتی:

–ئەوەتا هات.

خاتوو ئەلیف بەگوێیدا چرپاند:

–کێ؟!!

وتی: پیاوەکەم هاتەوە

هەرچەندە هاوسەرەکەی نورەفشان خاتوون لەشەڕی (کۆرە)دا بەرەحمەتی خودا چووبوو. هەمیشە باسی دەکرد، باسی حەسرەتی بێ کۆتاییو خۆشەویستی نەبڕاوەی ئەوی دەکرد.. لەلایەکی تریشەوە باسی ئەوەی دەکرد کە هاوسەرەکەی چەندە موسوڵمانێکی نموونەیی بووە.

ئەو لەکۆتا هەناسەیداو بۆ سەفەرکردنی لەزستانی دونیا بۆ بەهاری ئاخیرەت ڕۆحیانەتی هاوسەرەکەی هاتبوو بەشوێنیدا.

من ئەو ڕووداوەم بەچاوی خۆم بینی ئەوانەی ناو ژوورەکەش واقیان وڕمابوو.

پوورە نورەفشان دەستی درێژکرد، وەك ئەوەی بڵێ بادەستم بگرێو لەگەڵ خۆی بمبات، پاشان ئاوڕی دایەوەو وتی:

–گەردنم ئازادکەن ئێمە ئیتر ڕێبوارین، دواتریش بەدەنگێك کە هەموو بیستمان شایەتومانی هێنا کۆتا قسەشی ئەمەبوو:

–خوایە گیان ئێمە هەموومان مولکی تۆینو هەر بۆلای تۆش دەگەڕێینەوە، شەرمەزارمان مەکەو بەدیدارتمان شاد بکە.

وەك ئـەوە وابـوو ئـەو خانمـە فریشـتە ئاسـایە بەبەرچـاومەوە بـەرەو بەهەشـت بفـڕێ، وەك ئـەوەی خـەریك بـوو ئـەنجامی چـاکەکانی هـەر لـەم دنیایە وەردەگرت.

ئەوە یەکەمین وانە بوو بۆ ئێمە، لەو ڕاستییە تێگەیشتین بەئیمانـەوە مردنو ڕزگارکردنی ژیانی هەتاهەتایی گەورەترین دەوڵەمەندییە؟! !

لەسەر جێگەکەی پاڵیانخست، چـەناگەو قاچـەکانیان بەسـت سـەرنجم دەدا، خاتوو ئەلیف هیچ نەگریا، خاتوونێکی تابڵێی خوێن ساردو بەرگـەگر بوو، هەرچی دایکشم بوو بێ وەستان فرمێسکی دەڕشت. چـونکە مـەرگی پووره نورەفشان لە هەمووان زیاتر کاری دەکردە سـەر ئێمـە. بەواتایـەکی تر مردنی ئەو کۆتایی خۆشیەکانمانو سـەرەتای دەسـت پێکردنـەوەی بـێ چارەییو ئازارەکان بوو.

دووبارە ڕۆژە سەختەکان چاوەڕێمان بوون.

دووبـارە تـرسو دڵـەڕاوکێ باڵیـان بەسـەردا کێشـابوینەوە، دووبـارە ڕووداوە ترسـناکەکان ڕیزیـان بەسـتبوو، دیسـان ڕووداوەکـان بـۆ تاقیکردنەوەی ئێمە خۆیان ئامادە کردبوو.

## لە ماڵ دەرکراین:

دوای تەواوبوونی پرسەی پووره نورەفشان کچەکەی هات، وتی:

-بەدوای شوێنێکی تردا بگەڕێن چونکە ئـەم ماڵـە دەفرۆشـرێت، چـیتر ناتوانین ئێوە لێرە ڕاگرین.

لەدوای ئەوە دوونیای ئێمە وێران بوو، دەبوایە بـڕۆین بۆکـوێ؟ نـەهیچ کەسێکمان هەبوو تا لای بمێنینەوە نەکارێکیش کە بتوانین بیکەین.

هەرچی منیش بووم دەبوو دوای دوو مانگی تر بچمە قوتابخانە. بەر لەوەی خەیاڵیشی پێوە بکەم تووشی ئەو نەهامەتییە بووین، خوای گەورە هەزار جار لێی ڕازی بێت ئەلیف خاتوون یارمەتی داین لەشوێنێکی کەمێك دوور خانوویەکی سادەمان بەکرێ گرت.

بەیارمەتی ئەلیف خاتوون دووسێ پارچەی کۆنەمان کڕی بۆ ماڵەکە ئەگەرچی سادەش بوو، بەڵام چیتر شوێنێکمان هەبوو بۆ حەوانەوە کاتێکیش دایکم لەلای بەرگ دروویەك کاری دۆزییەوە وەك ئەوە وابوو هەموو دونیا بوبێت بەهی ئێمە.

خاتوو (ئەلیف)یش بەهەمان شێوەی پووره نورەفشان وازی لێ نەهێنان، بەردەوام سەردانی دەکردین و یارمەتی دەدایەن و دڵنەوایی دەکردین، جار جاریش هەوڵی دەدا بەپێی توانا پێداویستییەکانمان بۆ دابین بکات، چونکە پووره نورەفشان وەسیەتی بۆ خاتوو ئەلیف کردبوو.

—ئەوانە ئەمانەتی منن. ئاگات لێیان بێت و بەتەنیا جێیان مەهێڵە.

ئەلیف خاتوونیش خوا لێی ڕازی بێت بە بەردەوامی ئاگای لێمان بوو دەیپاراستین.

خودای مەزن لە تەنیشت بەندە خراپەکانیدا چەندین بەندەی چاکیشی هەیە.

خاتوو ئەلیف هەموو پێداویستییەکی قوتابخانەی بۆ ئامادەکردبووم هەر لەجل و بەرگ و جانتاوە تا کتێب و دەفتەر و پێنووسیش...

دڵخۆشی چوونە قوتابخانە هەموو گیانمی داپۆشیبوو. ئای لە دونیای منداڵی... سەرەڕای ئەو هەموو ناڕەحەتی و چەرمەسەرییە هێشتا خەیاڵەکان پەمەیی و دونیا ڕەنگاو ڕەنگ بوو. خۆزگە گەورەبوون نەدەبوو، خۆشیەکانی منداڵی هیچ کات تەواو نەدەبوو.

هەفتەی یەکەمی چوونە قوتابخانەم بوو.. لە هەوڵی خۆگونجاندندا بووم لەگەڵ قوتابخانەکەم و مامۆستاو هاوڕێکانمدا. بەڵام ئەو ڕووداوانەی بەسەرمدا هاتبوون بەشێوەیەك تووشی ترسنۆکیو شەرم یان کردبووم کە هەموانم بەدوژمن دەبینیو وامدەزانی لە هەر ئانو ساتێکدا دەیانەوێت ئازارم پێ بگەیەنن لەبەر ئەو هۆکارەش هەفتەی یەکەمی قوتابخانە زۆر ناخۆش تێپەڕی.

سێڤگی خاتوون کە مامۆستای سەرەتاییم بوو هەستی بە حاڵی من کردبوو، لەبەر ئەوە لەیەکەم وانەوە زۆر ئاگاداری دەکردمو خۆشی دەویستم و بە (کچە کاڵەکە) بانگی دەکردم، ئەو نزیکییەی مامۆستاکەم زیاتر ئیسراحەتی پێ دام.

ئەو ئێوارەیەبوو... هاتمەماڵەوە دەبینم دایکم خەریکە دەگری.

—باوەشم پیاکردو پرسیم: چی بووە دایکە؟

منی گوشی بەخۆیەوەو هەنیسکەکانی زیاتر بوو وتی:

—تاقە دۆستێکی ڕاستەقینە کە لەم دونیایەدا هەمان بوو (خاتوو ئەلیف) بوو ئەویشمان لەدەستدا.

—بەترسو مەراقەوە پرسیم: —مردووە؟

وتی: نا کچم، بەڵام یەکێك لە نزیکەکانی هاتو لەگەڵ خۆیدا بردی ئیدی ئەویشمان لەدەستدا.

من دەمزانی ئەوە واتای چیە؟! ئەو هەواڵە بۆ ئێمە کارەساتێکی تربوو، نەبوونی ئەلیف خاتوون، تاکە کەسێك کە لێمان تێدەگەشت و هەموو یارمەتییەکی دەداینو لەپێناوماندا فیداکاری دەکرد، واتای دەستپێکردنەوەی ئازارو ناڕەحەتی بوو.

ئـەو هەواڵـە ڕەشـەبایەکی ئەوەنـدە بـەهێزی لـەدونیای منداڵیمـدا هەڵکردبوو. بەبێ چارەییەکەوە لەدایکم پرسی:

–ئەی باشە لەمەودوا چی دەکەین؟

– خوا گەورەیە کچی خۆم

–ئێمە لێرەش وەدەردەنێن وانیە؟!

–إن شاء الله دەرمان ناکەن....

–ئەی ئەگەر کردیان؟

–تۆ خۆت بێتاقەت مەکە فریشتەکەم، ئەگەر لێرەش دەرمان بکەن خانوویەکی تر دەدۆزینەوە.

سەری خستمە سەر ئەژنۆی‌و بۆ کەم کردنەوەی ترس‌و دڵە ڕاوکێکەم دەستی بەسەرمدا دەهێناو هەوڵی هێورکردنەوەی دەدام.

ئـای... دایـەگیان تـۆ چـەند مرۆڤێکـی چـارەڕەش بویـت، تەنانـەت ڕۆژێکیش نەم بینیت بەدڵی خۆت پێ بکەنیت، ئەگەر ئیمان بەڕۆژی دوایـی نەبوایە: ئەگەر مـرۆڤ بـاوەڕی بـەدووبارە بەیـەك گەیشـتنەوەو لـەیادکردنی حەسـرەت نەبوایـە چـۆن دەیتـوانی لـەم دونیایـەدا ژیـان بەسـەر بـەرێت، تەنانەت بیرکردنەوەش لێی ئەستەمەو مێشکی مرۆڤ تەحەمولی ناکات.

## ئەوەی لێی دەترساین بەسەرماندا هات:

دوای ڕۆیشتنی خاتوو ئەلیف، خاوەن ماڵەکەمان لێمان ڕاست بوویەوە.

– کرێی ئەم ماڵە ئەلیف دەی دا، بەڵام ئێستا کە ئەو ڕۆیشـتووە ئێـوە ناتوانن پارەی ئەم خـانووە بـدەن، لەبـەر ئـەوە شـوێنێکی تـر بـۆ خۆتـان بدۆزنەوە باشترە، یەك هەفتە مۆڵەتتان هەیە...

دایکم وتی:

—کاری وەهامان لەگەڵ مەکە، کچەکەم تازە دەستی بەدەوام کردووە، هیچ نەبێ بهێڵە ئەم زستانە لێرە بمێنینەوە. دۆزینەوەی خانوو ئێستا زۆر قورسە ئەگەر بیشی دۆزینەوە لە شوێنێکی دوور دەستمان دەکەوێت ئەوکات دەبێت کچەکەم قوتابخانە بگۆڕێت بەستەزمانە تازە خەریکە وردە وردە ڕادێت.

کابرا بەشێوەیەکی ناشیرین وتی:

—ئەی لەکوێ پارەتان دەست دەکەوێت بۆ کرێی خانووەکە؟

—دایکیشم بەشەرمەزارییەوە وتی:

—من ئیش دەکەم پارەکەی پەیدا دەکەم، ڕەنگە جار جار دوابکەوێت بەڵام هەر پەیدای دەکەم، ناهێڵم دوابکەوێت، تکا دەکەم با ئەم زستانەش لێرەبین.

—من دەزانم مووچەی تۆ چەندە خانم.. ڕۆیشتم لەشوێنی کارەکەت پرسیارم کرد، ئەگەر هەموو ئەو پارەیەی کە وەریشی دەگریت بیدەیت هێشتا کرێی خانووەکە دەرناهێنێت، بەتەمای چۆن بەم پارەیە هەم کرێی خانوو بدەیتو هەم ماڵیش بەڕێوە ببەیت.

دایکم بەهەموو هێزیەوە دەپاڕایەوە.

—کەمێك پارەی دانراوم هەیە بۆ سێ مانگ بەشمان دەکات دواتریش خوا گەورەیە، شەرمەزارتان نابین.

سەرەڕای ئەو هەموو پێداگری و پاڕانەوەیەی دایکم، هێشتا کابرا قەناعەتی نەهێناو وتی:

—دوای هەفتەیەك دەبێت ئەم خانووە چۆڵ بکرێت ئەگینا هەموو شتەکانتان فڕێ دەدەمە دەرەوەو ڕۆیشت.

من و دایکم دووباره لەگەڵ ئازارو مەینەتیەکانماندا بەتەنیا ماینەوە، تەنها دڵنەواییەکمان فرمێسکەکانمان بوو چونکە هیچ شتێکی ترمان لەدەست نەدەهات.

# بەشی چوارەم

## فریشتەی چاکەخواز (مامۆستا سێڤگی)

### پوختەی ئەم بەشە

لەوکاتـەی دەمـانوت ڕووخـاین و تـەواو بـێ چـارە ماوینەتەوە، خوای گەورە مامۆستایەکی وەکو فریشـتە ناردە لامان. ژیانی بەئێمە بەخشیەوە، دەستی گرتین. بەڵام هێشتا تاقیکردنەوەی ژیانمان کۆتـایی نـەهاتبوو. ئەو هەواڵەی ژیـانمی وێـران کـرد هـەنگاو هـەنگاو نزیـك دەبوەوە.

# فریشتەی چاکەخواز

## مامۆستا سێڤگی

من لەو وەزعە ناخۆشـەدا چـووم بـۆ قوتابخانـە، مامۆسـتا سـێڤگی کـە هـەروەك ناوەکـەی دڵ پـڕ لەخۆشەویسـتی بـوو بەچـاوەکانمدا حاڵەتەکـە تێگەیشت وتی:

–کچە کاڵەکەم ئەوە چیتە؟ تائێستاش ئەو دەنگە نەرمـەی لـە گوێمـدا دەزرنگێتەوە.

لەبەرامبەر ئەو گرنگی پێدانە چاوەڕوان نەکراوەی ئەودا نەمتوانی خۆم لەبەرامبەر هەستەکانمدا ڕابگرم دەستم بەگریان کرد.

وتی:

–واز لەگریان بێنەو بڵێ بـزانم هۆکـاری ئـەم فرمێسـك ڕشـتنە جوانـەت چییە؟!

نەمتوانی زیاتر بەرگە بگرم و بە هەنسك هەڵکێشانەوە وتم:

–ئێمە لەماڵ دەردەکەن، ئەگەر بۆ شـوێنێکی دوور بـڕۆین ناچـار دەبم قوتابخانەکەم بگۆڕم.

مامۆستا باوەشی کردەوەو بەخۆشەویستییەوە لەباوەشی گرتمو وتی:

تۆ بۆچی خۆت بێتاقەت کردووە: من تـۆ بەکـەس نـادەم، تـۆ کچـەکاڵە تاقانەکـەی منیـت، مـن لەگـەڵ دایکـت قسـە دەکـەمو بـەم نزیکانـە

خانوویەکتان بۆ دەدۆزینەوە. دەی تۆ دانیشەو مەگری تا ئەوکاتەی من مامۆستات بم ناهێڵم کەس بتگرێنێت.

خوای گەورە مامۆستا سێڤگی (دڵ ئاڵتوونی) کەخۆشەویستی بەدەورووبەری دەبەخشی بۆ ئێمە ناردبوو، ئێمە دەرگایەکمان لێ داخرابوو بەڵام خوای گەورە دەرگایەکی دیکەی بۆخستبووینە سەرپشت.

مامۆستا سێڤگی خاوەنی دوو منداڵ بوو، کچە گەورەکەی (نوریە)کە دوو ساڵ لە من گەورەتر بوو و، کوڕێکیشی هەبوو بەناوی سەعید کە هێشتا نەچووبووە قوتابخانە.

هاوسەرەکەی بەهۆی نەخۆشی دڵەوە کۆچی دوایی کردبوو، خۆیشی خاتوونێکی دینداربوو، ئامانجی ژیانی بریتی بوو لە هاوکاریکردن و کۆمەکی کردنی نەدارو بێ کەس و لێقەوماوان، کەسێکی فیداکارو دڵ پڕ لەخۆشەویستی بوو.

لەدوای تەواو بوونی وانەکان لەگەڵ مندا هاتەوە بۆماڵمان، لەگەڵ دایکم یەکتریان ناسی، لەدوای بیستنی ئەو ڕووداوەی کە بەسەرماندا هاتووە زۆر دڵگران بوو.

وتی:

-من لەگەڵ خاوەن ماڵەکەتاندا قسە دەکەم ئێوە هیچ خەمتان نەبێت ئەم کێشەیە چارەسەر دەکەین.

خودا هەزار جار لێی ڕازی بێت ڕۆیشتبوو لەگەڵ خاوەن ماڵەکەماندا قسەی کردبوو وتبووی:

-من کەفیلی پارەکەتانم، هەموو مانگێك دەتوانن داوای کرێی خانووەکە لەمن بکەن، بەم شێوەیەش خاوەن ماڵەکەی ڕازی کردبوو.

دایکم لەخۆشیدا دەپاڕایەوە، ئەگەر وانەبوایە دەبوو حاڵی ئێمە چی لێ بهاتایە! چونکە ئێمە دەمانزانی ئەگەر لەو ماڵە دەربچوینایە نەماندەتوانی ماڵێکی دیکە بدۆزینەوە، لەبەر ئەوەی باری ئابووریمان لاوازبوو، بەلام سوپاس بۆ خودا دووبارە ئیشەکان بەرەو باشی ڕۆیشتن.

خوای گەورە هەزارجار لە مامۆستا سێڤگی ڕازی بێت، هەموو سەری مانگێك کرێی خانووەکەی دەداین و لەو نەهامەتیە ڕزگاری دەکردین.

دایکم بۆئەوەی لەپێش چاوی مامۆستا سێڤگی شەرمەزار نەبێت لەماڵەوە بەرگ دروویی دەکردو کۆتایی هەفتەش دەچوو بۆ خاوێن کردنەوەی ماڵان.

ئەمەش ئەو حاڵە بوو کە خانمێکی بە بنەماڵە دەوڵەمەندو خوێندەوارو تێگەیشتوو زۆر جوانی وەك دایکمی تێکەوتبوو، بەلام دایکم هیچ کات بە خراپە باسی بنەماڵەکەی نەدەکرد. بەتایبەتیش دوای موسوڵمان بوونی هیچ کات گوێم لێ نەبووە گلەیی و گازەندە بکات، تەنها شتێك کە لەکاتی بێزاریدا پەنای بۆ دەبرد گریان بوو، ئەو فرمێسکانەی تنۆك تنۆك کە بە ڕووخساریدا دەهاتنە خوارەوە بووبوونە مایەی دڵنەوایی بۆی.

لەگەڵ قوتابخانەکەمدا زۆر ڕاهاتبووم لەڕاستیدا بەهۆی ئەو هەموو سۆز و خۆشەویستییەی مامۆستا سێڤگی یەوە بەشێوەیەك لەگەڵ هاوڕێکانم و وانەکانمدا پەیوەندیم باش بوو کە لەماوەیەکی کەمدا بوومە باشترین قوتابی پۆلی یەکەم، مامۆستاکەم جارجار لەناو قوتابیەکاندا وەسفی دەکردم و دەیوت:

—چاوتان لێیە کچەکاڵەکە چەند زیرەکە؟

بەلام ئەو خۆشییەی منداڵیم زۆری نەخایاند، دووبارە پەڵە هەورە ڕەشەکان لە ئاسۆی ژیانمدا دەرکەوتنەوە، دووبارە گێژەڵوکە هەڵی کرد،

بەڵام ئازارو کارەساتی ئەمجارە لەگەڵ ئازاری جارەکانی تردا بەراورد نەدەکراو لەگەڵ چەرمەسەرییەکانی تردا پێوانە نەدەکرا.

## ژیانم لێ تاریک بوو:

کۆتا هەفتەکانی قوتابخانەبوو، هەموو لە خۆشی کارت وەرگرتندابووین. چاوەڕێی سەرکەوتن و یەکەم خەڵاتیش بووم، لە خەیاڵی ئەوەدا بووم کارتەکەم وەربگرمو خێرا بگەڕێمەوە نیشانی دایکمی بدەم... چەند هەستێکی خۆش بوو:

–چوار پۆلی قۆناغی یەکەم لەقوتابخانەکەماندا هەبوون، هێشتا کارت وەرنەگیرا بوو، بەڵام دەنگوباسی یەکەم بوونی من هەبوو، بەتایبەتیش لەوانەی بیرکاریدا زۆر زیرەك بووم مامۆستاکەم لەزانیارییەکانی من لەبورای بیرکاریو ئاستی منو هەوڵدانم سەری سوڕمابوو، هەمیشە دوعای بۆ دەکردم:

–خوا لەچاوی پیس بەدوورت بگرێت کچەکە کاڵەکە.

ئەو ڕۆژە ڕەشە هات...

هەرچەندە زۆر منداڵ بووم کەچی ئەو ڕۆژە بێتاقەتییەکی زۆر دای گرتبووم بێتاقەتییەك کە نەمدەتوانی ناوی لێ بنێمو سەرچاوەکەشیم نەدەزانی...

لەدەرسابووین...

بەڕێوەبەری قوتابخانەکە هاتە پۆلەوە، بەڵام لەدەمو چاویدا کەمترین زەردەخەنەو خۆشی دەرنەدەکەوت، ئەگەرچی کەمیش بێت زەردەخەنەی نەکرد بەرەو ڕووم هات دەمو چاوی تێکچووبوو ڕووی ساردی پێوە دیاربوو بەواتایەکی تر دیاربوو هاتبووە پۆل تا هەواڵێکی ناخۆش بدات...

دەتوت بەو دڵە بچوکەی منداڵیمەوە هەستم پێ کردووە، تەنانەت دەمزانی کە ئەو هەواڵە ناخۆشە سەبارەت بەمنە، لەبەر ئەوە پێش ئەوەی هەواڵەکە بزانم دڵم کەوتە تەپە تەپ، دڵم بەجۆرێك ئازاری هەبوو هەناسەمی توند کردبوو.

چاوم لەسەر بەڕێوەبەرەکە بوو...

خۆی نوشتاندەوەو بەگوێی مامۆستاکەمدا چرپاندی، مامۆستاکەشم لەناکاو ڕەنگی تێکچوو لێوی بەئازارێکەوە گەستو ڕووی کردە من، بەڕێوەبەرەکە چووە دەرەوە، ئەگەرچی لەوکاتەدا زەنگی چوونە دەرەوەش لێی دا مامۆستاکەم هاتەلام و بەزەردەخەنەیەك کە بەزۆر خستبوویە سەر لێوی وتی:

–کچەکاڵەکە، جانتاکەت هەڵگرە بابڕۆین.

بەچاوێکی پڕ ئازارەوە لێم ڕوانی‌و بەقورگێکی پڕەوە پرسیم:

–شتێك بووە مامۆستا؟!

بۆئەوەی دڵنەوایم بکات وتی:

–نا نا هیچ شتێك نەبووە.. تەنها دایکت نەخۆش کەوتووە، بۆ ئەوەی خەفەت نەخۆیت هەواڵی بۆ ناردویت.

بەترسێکەوە پرسیم:

–نەخۆشی چی؟!

–شتێکی وانیە، لەوانەیە بەهۆی کارکردنی زۆرەوەبێت... ئێستا پێکەوە دەڕۆین خۆت دەیبینیت، شتێکی وانیە لێی بترسیت، ئێمە هەموو نەخۆش دەکەوین گیانەکەم، خۆنابێت بۆ هەموو نەخۆشییەك بترسین؟

بەڵام هەستەکانم و تۆفان‌و هاواری ناخم وایان نەدەوت: هەموو ئەمانە دەیانویست هەواڵی کارەساتێکی تاریکتر بدەن.

ئای دایەگیان: خوانەکات تۆ هیچت لێ بێت، من بەبێ تۆ چی بکەم؟ ئەگەر تۆ شتێکت لێ بێت من چیتر ناتوانم بژیم منیش شوێنت دەکەوم.

بەڕێوەبەری قوتابخانەکە من و مامۆستا سێڤگی خستە ناو سەیارەکەیەوەو بەخێرایی کەوتەڕێ، تا زیاتر بڕۆیشتایە زیاتر حالّم تێك دەچوو.

لەڕێگادا سەیارەکە بەرەو مالّمان نەڕۆیشت، بەشلّەژاوییەکەوە بەمامۆستاکەمم وت:

—ئێمە بۆکوێ دەڕۆین؟ مالّەکەمان بەجێ هێشت!

وتی: دەڕۆین بۆ نەخۆشخانە کچەکەم دایکت لەوێیە.

دووبارە دەستم بەگریان کردەوە، مامۆستا (سێڤگی)یش لەناخیەوەو بەهەموو هەستی دایکایەتیەوە خەریك بوو دلّنەوایی دەکردم.

کاتێك چوومە ئەو ژوورەی کە دایکمی لێ بوو، تووشی شۆك بووم ئای خوایەگیان!!!

کاتێك دایکم بەو شێوەیە بینی هەر لەوێدا بورامەوە... دواتر بیرم نایەت چی ڕوویدا...

کاتێك چاوم کردەوە کەسانێکی زۆر بەسەر سەرمەوە بوون.

—دەستم بەهاوارکرد، دایکم چی لێ بەسەر هاتووە؟!

منیان برد بۆ لای دایکم، بەلاّم دایکم نەگوێی لە هیچ بوو نەئاگای لەدەوروبەری بوو.

## حەزم دەکرد بمرم:

لەکۆتاییدا ئەو هەواڵە دڵتەزێنەم بیست.

لەماڵی ئەو خانمە بەرگدرووەی کە دایکم کاری لێ دەکرد غاز تەقیبویەوەو بەداخەوە ئاگر کەوتبووەوە، هەمووان خۆیان دەرباز کردبوو بەڵام دایکم نەیتوانیبوو، ئیتر ئەو کارەساتە ڕووی دا بوو، دایکی بێ چارەم لەنێو ئاگرەکەدا مابووەوەو زۆر بە سەختی سوتابوو.

ئاگام لەخۆم نەبوو، دەموت:

– کێ دەتوانێت بەرگەی ئەم ئازارە بگرێت، لەمەودوا کێ دڵنەواییم دەداتەوە؟ ئەم هەموو بەڵاو نەهامەتیە لەبەرچییە؟ بۆچی ئەم ئازارانە یەخەی ئێمە بەرنادەن؟ ئێمە چی خراپەیەکمان بۆ خەڵکی هەبووە؟ بۆچی بەڵاو ناڕەحەتیەکان لەئێمە زیاتر کەسیان دەست ناکەوێت؟!

نەمدەزانی چی دەڵێم! ! وڕێنەم دەکرد خەریك بوو قیامەتم هەڵدەستاند. ئەو شێوەیەی دایکم تائێستاش لەبەرچاوم لاناچێت، جەستەیەك لەنێو ئاگردا برژا، هەستی لەدەست دابوو، کاردانەوەی بۆ هیچ شتێك نەبوو.

خوایەگیان چۆن بەرگەی ئەمە بگرم؟؟

دکتۆرەکە هاتەلام دەستی گرتمو لەسەر قەرەوێڵەکە دای نیشاندم، وتی:

–سەیرکە کچی جوان! ئێستا دایکت هیچ گوێی لە تۆ نییە لەبەر ئەوە هاوارمەکە، تەنها دوعای بۆبکە، هەموومان خودا دروستی کردووینو هەر ئەویش دەمانباتەوە، هاوارو گریانی ئێمە هیچ شتێك ناگۆڕێت ئەگەر دەتەوێت دایکت دڵخۆش بکەیت تەنها چەند کارێکی گرنگ هەیە کە تۆ دەتوانیت ئەنجامیان بدەیت.

"هەوڵی زۆر بدەیت و، سەرکەوتوو بیت و هەموو ڕۆژێکیش دوعای بۆ بنێریت".

وە لە کۆتایدا جوانی جوانان، ئەو دایکەی کە لەتەمەنیدا ڕۆژێکی خۆشی نەدی و هەمیشە لەگەڵ سەختیەکانی ژیاندا دەجەنگی، ئەو دایکەی کە نموونەی ئارامی بوو لەدەستمدا...

منیش حەزم دەکرد بمرم چیتر نەمدەتوانی بەو شێوەیە بژیم، تەنانەت بۆ چرکەیەکیش نەمدەتوانی بەبێ ئەو بژیم، من بەبێ ئەو دەبوو چی بکەم؟!

نا... نەخێر ئەمەم پێ قبوڵ نەدەکرا...

لەوێدا... هەر لەوێدا بڕیام دا خۆم بکوژم... چونکە چیتر کەسێکم نەبوو.. من دەبوو پەنا بۆ کێ ببەم؟ لای کێ بمێنمەوە؟! ئەو دونیای منداڵیەی من ئامادەی بەرگەگرتنی ئەو هەموو ئازارو تەنیاییە نەبوو، نەمدەتوانی بەگەر بگرم دەبوو دەستبەجێ لەو کاتەدا کە دایکم تازە وەفاتی کردبوو ئەو کارە بکەم... دەبوو تەواوی بکەم. جەرگم کون کون بووبوو و دڵم خوێنی لێ دەتکا...

لەوکاتەدا بیرۆکەیەك هات بەمێشکمدا..

(لەپەنجەرەکەوە خۆم فڕێ بدەمە خوارەوەو کۆتایی بەژیانم بهێنم).

لەو کاتەدا ئەم ئێشە زۆر ئاسان بوو، خۆکوشتن لەلام زۆر ئاسانتربوو لە چاو ئەو ئازارەی کە تیایدا بووم.

هیچ هەستم بەئازار نەدەکرد، لەمێشکمدا کەمترین ترس لەمەرگ نەبوو، تەنها ئاواتێکم هەبوو، لەگەڵ دایکم بمرمو پێکەوە لەم ژیانە بڕۆین...

## بەرەو مەرگ ڕۆیشتم:

ئەو شوێنەی ئێمەی لێ بووین قاتی سێ بوو، سەیرێکی پەنجەرەکانیم کرد یەکێیان زۆر لێمەوە نزیك بوو.

لەو کاتەدا مامۆستا سێڤگی دەستی گرتبووم تا ئارامم بکاتەوە. لەچرکەیەکدا خۆم لەدەستی مامۆستا سێڤگی ڕزگارکردوو بەرەو پەنجەرەکە ڕام کرد.

بێ ئەوەی بوار بەکەس بدەم تا بڵێیت: ئەم کچە خەریکی چییە؟

چاوەکانم داخست و خۆم فڕێ دایە باوەشی دونیای هەتا هەتاییەوە، لەو کاتەدا دایکمم لەبەردەممدا بینی، باوەشی کردبووەوە بەرەو ئامێزی ئەو چوومە خوارەوە.

دایکم بەو دەنگە سیحراوییەیەوە وتی:

-وامەکە جانانەکەم، خۆ من نەمردووم کچەکەم، من دەژیم چونکە شەهیدەکان نامرن، تەنها دونیاکانیان دەگۆڕێت، منو باوکت پێکەوەین چاوەڕێت دەکەین.

ڕێك کەوتمەوە ناو باوەشی دایکم، دایکم وتی:

-سوپاس بۆ خودا هیچت لێ نەهات... لەمەودوا چی تر کاری وانەکەیت بۆ منیش مەگری، گەورەترین پشتو پەنای تۆ پەروەردگارە تەنها پشت بەو ببەستە.

کاتێك چاوەکانم کردەوە دووبارە کەسانێکی زۆر لەدەورم کۆبووبوونەوە.

گوێم لەدەنگی ئەو دکتۆرە بوو کە پێشتر دڵنەوایی کردم دەیوت:

-شتێکی باوەڕ پێ نەکراوە؟! خودا ویستی موعجیزەمان نیشان بدات. سەیرکەن دەڵێی ئەم کچە کەوتوەتە سەر شتێکی زۆر نەرم هیچی

لێ نەهاتووە، ئەو شوێنەی ئەمی لێ کەوتوەتە خوارەوە پڕە لەبەردو چیمەنتۆ دەبوو جەستەی پارچە پارچە ببوایە کەچی هیچی لێ نەهاتووە ! !

سەیرکەن لە وێنە تیشکیەکاندا هیچ دیار نیە !

خوایەگیان تۆ خۆت ئەم کچەت پاراست، جگە لەمە هیچ لێدانەوەیەکی تر بۆ ئەم ڕووداوە نیە.

-هارو هاج... ئەمجارە ڕزگارت بوو، بەشێوەیەکیش ڕووداوەکە لە موعجیزە دەچێت خودا بەجۆرێك ڕزگاری کردیت وەك ئەوەی کەوتبێتیتە ناو باوەشێکی نەرمەوە، لەمەودوا بەهیچ شێوەیەك کاری وا سەرشێتانە دووبارە نەکەیتەوە، دەی بەکەفارەتت بێت.

لەقسەکانی دکتۆرەکە تەنها گوێم لەمەبوو:

"کەوتیتە باوەشێکی نەرمەوە"

ئای دایەگیان، تۆ چەندە کەسێکی موبارەکیت: باوەشت کردەوەو منت لەئامێز گرت، بەڵام ئەم مرۆڤانە چی دەربارەی ڕاستییەکان دەزانن؟ ئەوان پێیان وایە من کەوتومەتە سەر بەردو چیمەنتۆ هیچم لێ نەهاتووە، بەڵکو من کەوتمە نێو باوەشی نەرمی دایکمەوە.

کەواتە دایکم نەمردووە؟ کەواتە شەهیدەکان نامرن! ! تۆبڵێی ئەمە واتای چی بێت؟

شەهیدی چییە؟ بۆچی شەهیدەکان نامرن؟! ئەی لەکوێ دەژین؟ دایکم بۆچی سوتا؟ کە خودا موسوڵمانانی خۆشدەوێت بۆچی دایکمی فڕێ دایە ناو ئاگر؟

ئەو چی گوناهێکی کردبوو تا شایەنی ئەو هەموو بەڵایە بێت کە بەسەری دا هاتن؟ ئەمانەو چەندەها پرسیاری هاوشێوە مێشکمیان داگیر کردبوو.

کەوتبومە گێژاوێکەوە کە منداڵێك لەو تەمەنەدا نەی دەتوانی بەرگەی بگرێت. بەتایبەتیش کاتێك وەڵامی ئەو پرسیارانەم دەدۆزییەوە وەك ئەوەی دەمویست لەو دونیای منالیەمدا کەسێك بخەمە ژێر لێ پرسینەوە، دەبوو کەسێك لەبارەی دایکمەوە قەناعەتم پێ بکات، ئەگەرنا ئەو هەموو ئازارەم بەتەنیا پێ هەڵنەدەگیرا، ئەمڕۆ خۆکوشتنەکەم سەری نەگرت بەڵام ئامادەبووم دووبارە هەمان سەرکێشی و هەمان هەڵە دووبارە بکەمەوە.

## من چیتر نەمدەتوانی بژیم:

بڵێم چی؟! خودا هەزارجار لە مامۆستا سێڤگی ڕازی بێت... ئەوەندەی هاوکاری کردم کە ناتوانم باسی بکەم.

منی لەگەڵ خۆی بردەوە بۆ ماڵی خۆیان، چونکە ئەو شوێنەی من پێم دەوت "ماڵەکەم" پڕبوو لە یادگاری دایکم، منیش نەمدەتوانی لەوێ بەرگەبگرم.

لەپرسەکەشدا ئاگای لێم بوو جێی نەدەهێشتم ئەو وتی:

–پێکەوە دەڕۆینە سەر گۆڕی دایکت، ئەو نەی دەویست لەوەزیاتر خەفەت بخۆم.

مامۆستا سێڤگی و بەڕێوەبەری قوتابخانەکە ڕێو ڕەسمی پرسەکەیان گرتە ئەستۆو گۆڕێکی سادەیان بۆ دایکیشم دروست کرد، ئیتر ئەوێ بووبووە ماڵی یەکەمی من.

وام هەست نەدەكرد دەژیم! ڕۆژانە زۆربەی كاتەكانم لەسەر گۆڕی دایكم بەسەر دەبرد. قسەم لەگەڵ دایكمدا دەكرد، كێشەكانم بۆ باس دەكرد، ئازارو مەینەتیەكانم لەگەڵ گۆڕەكەدا باس دەكرد، (مامۆستا سێڤگی) یش هیچ كات بەتەنیا جێی نەدەهێشتم.

دەتوانن بیربكەنەوە؟ ئەگەر منداڵێكی تەمەن ٧ساڵ دایك و باوكی لەدەست بدات چی دەكات؟ كێ دڵنەوایی دەكات: فرمێسكەكانی بەچی دەوەستێت؟ چ شتێك دونیا تاریكەكەی ئەو ڕووناك دەكاتەوە؟ دەتوانێت بچێتە لای كێ؟ لەكوێ ئیسراحەت دەكات؟

بەڵێ! بەڕاستی من مردوویەكی زیندوو بووم.

مامۆستا سێڤگی بۆ بەرگرتن لەو داڕووخانەی من، بۆ ڕێگرتن لەدووبارەبوونەوەی خۆكوشتنێكی تر هەرچی لەدەست بهاتایە دەیكرد. ئەوەی ئەو دەیكرد تەنها دایكێك بۆ منداڵەكانی خۆی دەیتوانی بیكات، سوپاس بۆخوا كە لەكۆمەڵگەدا هێشتا خێرخوازو مرۆڤی چاك لەناو نەچوو بوون. لەبەر كەسانی لەمجۆرەیە كە ئەم كۆمەڵگەیە تا ئێستاش لەسەرپێ ماوە.

## بوومە منداڵێكی مەعنەوی:

مامۆستا سێڤگی ڕۆژێك منی دانیشاندو وتی:

-دەمەوێت شتێكی گرنگت پێ بڵێ، تۆ هەم قوتابی منیت، هەم كچی مەعنەویشمیت، چیتر ناتوانم بەتەنیا جێت بهێڵم لەماڵەوە چی كەلوپەلێكت وا گرنگ نیە دەیفرۆشین‌و خەرجی تۆی پێی دابین دەكەین.

دەمەوێت بتبەمە لای خۆم. بۆ خۆت لەژووری منداڵەكانمدا پێكەوە دەمێنیتەوەو دەبیتە كچی مەعنەوی من!

تا لەتوانامدا بێت دەتخەمە بەر خوێندن، هەوڵ دەدەم هەم جێگەی باوك هەم جێگەی دایکیشت بۆ بگرمەوە، هەرچیەکمان هەیە پێکەوە دابەشی دەکەین، ئەگەر ئەمە قبوڵ بکەیت زۆر دڵخۆش دەبم.

چاکەی وا لەکوێ بیستراوە؟ کەسێکی دڵباشی وەها لەکوێ بینراوە؟ تۆ بڵێی کەسایەتی وەها بەبەزەیی و بەسۆزی دیکە لە دونیادا هەبێت؟!

هیچ چارەیەکی ترم نەبوو، من لەتەمەنێکدابووم کە نەمدەتوانی ئەم داواکارییە گەرمەی مامۆستا سێڤگی ڕەت بکەمەوە.

مامۆستا سێڤگی لەناخیەوەو بەهەموو بەسۆزییەکیەوە دەیویست ئاسوودەم بکات. هەموو پێداویستی یەکانی بۆدابین دەکردم، دەیویست بەتەواوی ڕۆڵی دایکێك ببینێت بۆم زاراوەی "کچەکاڵەکەم" بەردەوام لەسەر زمانی بوو.

ئیتر ژیانێکی تازە بەڵام داپۆشراو بەئازار لەبەردەممدا بوو.

دووبارە خودا لە مامۆستا سێڤگی ڕازی بێت ئەگەر ئەو نەبوایە من چیم بکردایە؟

قوتابخانەش تەواو بووبوو.

مامۆستا سێڤگی لەگەڵ منداڵەکانی تری دا هاوین منیشی ناردە وانەی قورئان فێربوون، مامۆستای قورئانمان خانمێکی گەنجی زۆر لەدڵا شیرین بوو... هەر کە منی بینی:

—ئاااا... تۆ چەندە کچێکی جوانی! تۆ سەیری ئەو قژە زەردەو ئەو چاوە جوانانەی بکە...

دەستی گرتمو هێنامییە لای خۆیو وتی:

— تۆ کچی کێیت؟

ئەو پرسیارە هی ئەوەیە لەمنداڵێك بکرێ کە دونیای تاریك بووە! کە خەریکە لەناو نەهامەتیەکاندا دەخنکێت؟؟!! بەڵام خۆ مامۆستا خاتوون لەکوێ بزانێت!

دەستم بە گریان کرد مامۆستا زۆر شڵەژاو وتی:

–چی بووە کچم؟ بۆ دەگریت؟!

دادە نورییە وەڵامی ئەو پرسیارەی دایەوەو بەکورتی بەسەرهاتەکەی گێڕایەوە.

مامۆستاکەش وتی:

–بەڕاستە!!!

دووبارە لەباوەشی گرتمو لەپاڵ خۆیدا دای نیشاندمو پاشان وتی:

–کەواتە... پێویستە لەگەڵ تۆ کەمێك قسەبکەین..

دەستی کرد بە دڵنەوایی کردنم. هەروەها بەباسکردنی جوانیەکانی مردن وەك چۆن دەتوانم لە ڕۆژی دواییدا بە باوکمو دایکم شادببمەوە.

لەو کاتەدا دووبارە پرسیارە بێ وەڵامەکان هێرشیان بۆمێشکم هێنایەوەو لەبەر هەست کردن بەنزیکی مامۆستا لێمەوە دەستم بەپرسیار کردن کردەوە.

–دایکم بۆ کوێ ڕۆیشتووە؟ ئەو شەهیدبووە؟ شەهیدی واتایی چییە؟! ئەو ئێستا لەژێر خۆڵدا چی دەکات؟! چی بەسەر جەستەییدا دێت لەژێر ئەو خۆڵەدا؟ ئەوان لەگەڵ باوکم یەك دەبینن؟ من چۆن دەتوانم بچم بۆلایان؟! ئەوان دەتوانن من ببینن؟! و چەندەها پرسیاری هاوشێوەی تر...

لایەنی هاوبەشی پرسیارەکانم هەموو بەهۆی ئەوەبوو کە بزانم دایکمو باوکم لە چ وەزعێکدان، وەڵامی ئەو پرسیارانە بۆ ئەو دونیا منداڵییەی من

یەکجار گرنگ بوو، من پێویستییەکی زۆرم بەشیکردنەوەیان هەبوو بۆ ئەوەی ئیسراحەت بکەم.

مامۆستاکەم لەهەموو ئەمانە تێگەیشتبوو، بەڵام دەشی زانی کە من هێشتا لەتەمەنێکدا نیم تا لەمانە تێبگەم لەبەر ئەوە وتی:

–شیرینەکەم... تۆ هێشتا منداڵی، کەمێکی تر گەورە ببە هەموو ئەمانەت تێدەگەیەنم.

من یەکسەر ناڕەزاییم دەربڕی وتم:

–نەخێر... من چیتر گەورە بووم، هەموو شتێك دەزانم، هەموو نمرەکانیشم زۆر باشن.

ئەو زەردەخەنەیەی لەسەر لێوی مامۆستاکەم دەرکەوتبوو زیادی کردو بە سۆزێکەوە دەستی بەسەرمدا هێناو وتی:

–بێگومان گەورەبوویت، بەڵام کەمێکی تر گەورە ببیت ئەوکات باشتر تێدەگەیت.

ئیتر منیش بێدەنگ بووم.

# بەشی پێنجەم

## ئەگەر باوەڕم بەدوارۆژ نەبوایە،
## هەزارجار هەوڵی خۆکوشتنم دەدا

**پوختەی ئەم بەشە**

دەزانن لەدەستدانی تەنها کەسی ژیانم و بە تەنها مانەوەم وەکو منداڵێکی بچووك چ مانایەکی هەیە؟ ئەگەر ئەو خۆشەویستی و باوەڕە نەبوایە کە مامۆستا سێڤگی فێری کردم بۆ گەیشتنەوەم بە دایك و باوکم لە ڕۆژی دواییدا، دڵنیام ئێستا نەدەژیام. چونکە لەناو ئازاری بەرگە نەگیراودا حەسرەتی بێ کۆتاییم دەچەشت.

# گرنگی باوەڕهێنان بە ڕۆژی دوایی بۆ منداڵان

بەڵام مردن، گۆڕ، ڕۆژی دوایی، شەهید، بەهەشتو نموونەی ئەوانە هیچ کات لەبیرم دەرنەچوون، وەك ئەوەی بە دۆزینەوەی وەڵامێك بۆ ئەو پرسیارانە دەمتوانی ئەو دایکەم کە لەدەستم داوەو ئەو باوکەم کە بێجگە لە وێنەکەی هیچ کات نەمدیبوو بدۆزمەوەو دەمویست دڵنیابم کە ئەوان لەشوێنێکی پارێزراو دان.

ئەمەش گرنگی باوەڕبوون بەڕۆژی دوایی بەتایبەت بۆ منداڵ دەردەخات. ئەگەر منداڵێك کە دایكو باوکی لەدەست داوە باوەڕی بە دووبارە شادبوونەوە پێیان نەبێت چۆن دەتوانێت دڵنیابێتو دووبارە دەست بەژیان بکاتەوە؟!

باوەڕ بوون بە لێك دابڕانی هەتا هەتایی و، دووبارە بەیەك نەگەیشتنەوە ئەو منداڵە بەزیندوویی دەمرێنێت و هەموو ئومێد و خۆڕاگرییەکانی دەفەوتێنێتو نایهێڵێت.

من لەژیانی خۆمەوە زۆر باش لەم ڕاستیە تێگەیشتم، پێویستە باوەڕ بوون بەڕۆژی دوایی بە باشی بۆ منداڵان باس بکرێت، چونکە ئەو دینەی کە منداڵ لە منداڵێتیدا وەری دەگرێت، کاریگەری قووڵی لەسەر هەموو ژیانی هەیە، چونکە لە هەموو منداڵێکدا خولیایەك هەیە بۆ گەڕان بەدوای "هێزێکی بێ کۆتا"دا کە بتوانێت یارمەتی بداتو بیپارێزێت ئەم خولیایەی ناخی منداڵ ئاماژەیە بۆ پێداویستی ئەو منداڵە.

چونکە منداڵ کۆمەڵێك لە داخوازی هەیە وەکو ئاسایش، باوەڕ، خۆڕاگری، پاڵپشتی، قبوڵکردن، تەسلیم بوون، خۆشویستن. هەموو ئەمانە لەگرنگترین پێداویستیەکانن.

بەگشتی لەمنداڵاندا هەستێکی نەبڕاوە سەبارەت بەباوەڕبوون بە (الله) هەیەو ئەوان خودایان بەڕاستیەك قبوڵە کە نکۆڵی لێناکرێتو بەسەرچاوەی پاڵپشتیو ئاسایشی دەزانن.

چونکە کاتێك منداڵ لەناو کێشە جۆراوجۆرەکاندا خواستەکانی نایەنەدی، زۆر بەئاسانی دەتوانێت پەنا بباتە بەر دوعاکردن لە هێزێکی گەورەو بەتوانا.

هەستی باوەڕبوون بەخودا لە منداڵدا هەستێکی سروشتیە و ئەم هەستە دەبێتە سەرچاوەی دەستەبەرکردنی ئەو پێداویستیانەی کە لەناخیاندا هەیەو ئەم هەستەش لەگەڵ گەورەبوونیدا بەپێی ویستی خۆی گەشە دەکات.

لەڕاستیدا منداڵ لەخێزانی خۆیەوە فێری واتای پارێزگاری، دەسەڵات، پەیوەستبوون، باوەڕبوون، پشتبەستنو ئاسایش دەبێت.

لەگەڵ تێپەڕبوونی کاتو گەورەبووندناو لەگەڵ زیادبوونی ئەزموونی ژیاندا زیاتر لە واتای مردنو ژیان تێدەگات.

کەسێك کە باوەڕی بە خوای گەورەو هێزو توانای ڕەهای ئەو زاتە هەبێت و، باوەڕی بەوە هەبێت کە ڕووداوەکان بەویستی ئەو دێنە کایەوە، لەناخیدا هەست بەئومێدو هێزێکی گەورە دەکات. وەلەسایەی هێزی ئیمانەوە ناکەوێتە ناو سەرپێچی و گومڕابوونەوەو بەدوای ڕێگای ڕزگاریدا دەگەڕێت. بەهۆی ئەو هاوسەنگیەی کە ئیمان دروستی دەکات مرۆڤی

باوەڕدار دەتوانێت لە هەموو حاڵەتێکدا کەسێکی هاوسەنگ و، سەرکەوتوو ئومێدەوار بێت.

باوەڕهێنان بەخودا لەپاڵ ئەو ئاسوودەییەی کە دەیبەخشێت بەڕۆح چەندین سوودی بۆ مرۆڤ هەیەو، دەبێتە سەرچاوەی بەرچاوڕوونی مرۆڤ بەرامبەر بە ژیان و ڕووداوەکان و، کاریگەری ئیجابی لەسەر خووڕەوشت و هەڵسوکەوتی دادەنێت.

هەروەها بۆ ئەوکەسەی کە نزیکێکی لەدەست داوە. ئاشت بوونەوەی لەگەڵ خوادا، هانی دەدات بۆ ئەنجامدانی کاری خێر، کە ئەمەیش دەبێتە دڵنەواییەکی گەورە بۆ خاوەنی مردووەکە.

## خۆشەویستی مامۆستا سێڤگی:

ئەو فریشتەبوو، ئەو مرۆڤێکی مرواری ئاسابوو، ئەو نموونەیەکی چاکەو باشی بوو.

هیچ کات لە منداڵەکانی خۆی جیای نەدەکردەوە. هیچ کات وای لێنەکردم هەست بەنەبوونیو کەمو کورتی بکەم. کاتێک دەگەڕایەوە بۆ ماڵ یەکەم جار دەهاتە لای من، ڕوومەتەکانمی ماچ دەکردو بەکچەکاڵەکەم دەی دواندم، دەستی بەسەرمدا دەهێناو پرسیاری ئەو ڕۆژەی لێدەکردمو دڵنەوایی دەکردم.

چی بۆ منداڵەکانی بکڕییایە بۆ منیشی دەکڕی. نازانم چۆن وەسفی مامۆستا سێڤگی بکەم! ئەو بە مانای وشە فریشتە بوو.

ئای لە مامۆستایانی ئێستا!! ئەگەر تەنانەت لەسەدا یەکیان بەو جۆرەبوونایەو... خۆشەویستیان بە منداڵان ببەخشیایە ئەوا...؟! بەڵام کوان ئەوانە؟! زۆر کەمن.

بـا یادگاریـەکی ئـەو ڕۆژانـەتان بـۆ بگێڕمـەوە کـە هـەرگیز لـەبیرم ناچێتەوە.

من لەژوورەکەدا خەریکی وانە خوێندن بووم، بینیم وا مامۆستا سێڤگی هەردوو منداڵەکەی بانگکردووەو خەریکە شتێکی گرنگیان پێدەڵێت.

دەرگاکەش کراوەبوو بۆیە باش گوێم لێیان بوو:

مامۆستا دەیوت:

—زۆر ئاگاتان لەجانان بێت، بێ تاقەتی مەکـەن، ئـەو دایـكو باوکیشـی لەدەست داوە. لەبـەر ئـەوە زۆر خەفـەت دەخـوات، ئەگـەر ئێـوە دایکتـان بمرێـت زۆر خەفــەت دەخــۆن وانیــە!! جانـانیش بــەو شـێوەیە خەفــەت دەخوات. ئەو ئیتر خوشکی ئێوەیە پێویستە ئاگاتـان لێـی بێتـو خۆشـتان بوێتو کارێك مەکەن کە ئەو پێی بشکێت، یاخود بێتاقەت ببێت.

لەلای ئەو باسی دایكو باوکیشی مەکـەن، ئەگـەر باسـی بکـەن ئـەو زۆر دەڕەنجێـت هـەروەها لەبـەردەم ئـەودا شـەڕ مەکـەن، لەوانەیـە بیخاتـە سەرخۆیو وابزانێت لەگەڵ ئەوتانە. ئەمەش زۆر ئازاری دەدات.

ئـای... مامۆسـتا سـێڤگی ئەمـە چ گەورەییەکـە! چ وردبینیەکـە؟! چ ترسو خۆشەویستیەکە بۆ خودا؟!

تۆ بەڕاستی شایەنی دراوسـێیەتی پێغەمبـەری خودایتﷺ إن شـاء الله خودا ئەم پاداشتەت بەنسیب دەکات.

## پرسیارەکانی ناو مێشکم هەراسانیان کردبووم:

نزیکەی سێ ساڵ بەسەر مانەوەم لە ماڵی مامۆستا سێڤگی دا تێپەڕی بوو، پۆلی چوارەمیشم زۆر بەباشی بڕی.

من چی تر گەورەبوو بووم... لە زۆر شت تێدەگەیشتم. خوا لە مامۆستا سێڤگی ڕازی بێت، لەسایەی فێرکارییە وردبینانەکەی ئەوەوە تووشی هیچ گرفتێکی سەخت نەبووم. بەڵام بۆ ساتێکیش حەسرەتی لەدەستدانی دایکو باوکم لەمێشکم دەرنەدەچوو.

پرسیارەکانی ناو مێشکم بە تێپەڕیوونی کات زیاتر دەبوونو مەراقی زۆرشتی ترم دەکرد.

دووبارە لەگەڵ دادە نوریە لەپشووی هاویندا چووینەوە بۆ وانەی فێربوونی قورئان.

مامۆستای قورئانەکەم، کە باشترینی مامۆستایان بوو دووبارە دەستی بەپیاهەڵدان کرد بەسەرمداو دەیویست دڵنەوایم بکات:

—کچەکاڵەکەم هاتووە.

بەڵام وەك پسپۆڕێکی سایکۆلۆژی یەکسەر لەدونیای ناوەوەم تێگەیشتو لەکەشف کردنی ئاگرەکەی ناو دڵم دوانەکەوتو وتی:

—تۆ زۆر بیری دایكو باوکت دەکەیتو لەخەیاڵت دەرناچن وانیە؟

وەکو هەمیشە فرمێسکەکان بەگۆنامدا هاتنە خوارەوە. وتم :

—زۆریش بیریان دەکەم. هیچ کات لەخەیاڵم دەرناچن.

—ئای کچە جوانەکەم... ئەوان ئێستا لە بەهەشت زۆر دڵخۆشن تۆش خەریکی لێرە دەگریت!

وەك ئەوەی هەواڵێکی تازە لەوێوە هاتبێت سەیری دەمو چاوی مامۆستام کرد. وتی:

-بەڵێ ڕاستە... من ڕاست دەڵێم. شوێنی مرۆڤە شەهیدەکان بەهەشتە.

دووبارە پرسیارەکان هێرشیان بۆ مێشکم هێنایەوە چاوە پڕ فرمێسکەکانم بڕییە مامۆستاو وتم:

-تا ئێستا بەتەمانیت هەموو ئەمانەم بۆ ڕوون بکەیتەوە؟؟ زۆر پرسیار هەن کە مەراقمە وەڵامەکانیان بزانم، کاتێك لە مامۆستا سێڤگی دەپرسم ئاڕاستەی لای تۆم دەکات.

-ئەو خۆی شارەزایە لەم بابەتەدا، زیاتر دەزانێت ئاه... سێڤگی بۆچی ئەوەندە خاکیت!!

پاشان بەردەوام بوو

- سێڤگی لەجێی مامۆستای منیش‌و ئێوەشە، ئەو مرۆڤێکی تێگەیشتوو و نموونەییە. ئێمە زۆر سوودمان لەو بینیوە، ئەو لەکۆڕی خانماندا زۆر جار پەیامەکانی بۆ دەخوێندینەوەو بابەتی دینی بۆ باس دەکردین، کەواتە ئەو دەزانێت کە ئێوە هێشتا منداڵن بۆیە جاریێ بۆتان باس ناکات.

با ئێستا باسی ئەو بابەتانە بکەین کە تۆ تامەزرۆیت لەبارەیانەوە بزانیت. هیوادارم کەمی تەمەنت نەبێتە هۆی دەرچوونت لەژێر ئەم بابەتانەدا. بەڵام تۆ کچێکی زیرەکیت، دڵنیام زۆر باش تیێ دەگەیت.

## بەدەستپێکێکی جوان دەستی پێکرد:

ئەو خودایەی کە گەردوونی بەشێوەیەکی جوان‌و ڕێك‌و پێك دروستکردووە مرۆڤەکانیشی بەمەبەستی تاقیکردنەوە ناردوەتە دنیا. هەروەك چۆن ئێوە دەچنە قوتابخانە وانە دەخوێنن‌و پاشانیش کارت وەردەگرن.

هەموو مرۆڤێك ژیانێکی تایبەت بەخۆیو شێوازێکی تاقی کردنەوەی خۆی هەیە.

خوای گەورە هەموو ئەمانەی بۆ تاقیکردنەوەی بەندەکانی داناوە.

خوای گەورە گەردوونو دونیای بۆ مرۆڤەکان ئەفراندوەو پڕیشی کردووە لەو نیعمەتانەی کە دڵی مرۆڤی پێ خۆش دەبێت. مرۆڤەکان دێنە دونیا دەخۆنو دەخەون، دواتریش سەفەر دەکەنو دەڕۆن. ژیانی دونیاش دیاری دەکات، کە لەڕۆژی دواییدا شایەنی سزایە یاخود پاداشت.

بێگومان ئەو خودایەی کە بەم شێوە ناوازەیە ئەم کۆشکەی دروستکردووە، بەدڵنیاییەوە بۆ بەندە ئیماندارەکانی شوێنی پاداشتو بۆ بەندە سەرپێچی کارەکانیشی شوێنی سزای ئەفراندووە.

کەواتە دونیایەکی تریش هەیەو لەو دونیایەشدا دادگایەك هەیە بەوەش دەوترێت ڕۆژی دوایی.

چەندەها گوناهبارو سەرپێچی کار هەن پێش ئەوەی لە دونیادا بەتەواوی سزای تاوانەکانیان وەربگرن دەمرن.

کەواتە شوێنێك بۆ لێپرسینەوەیان هەیە.

لەم دنیایەدا هەر کەسەو تاقیکردنەوەی خۆی دەکات، بۆ براوەکان کۆشکو تەلاری ڕازاوە ئامادەکراوەو بۆ دۆڕاوەکانیش زیندانی هەتا هەتایی.

لە دونیادا هەمووان خەریکی خۆئامادەکردنو چاندنن. کەواتە دەبێت شوێنێك هەبێت کە پاداشتەکانیانی لێ وەربگرنەوە.

خوای گەورە بەهۆی ئەو کتێبو پێغەمبەرانەی کە ناردوونی بەڵێنی ڕۆژی دوایی داوە. هەروەها هەواڵی سزای هەتا هەتایی داوە. ئەمە واتای ئەوەیە کە ئەم بەڵێنەی دەباتە سەرو شوێنی ئەو سزایەی ئامادەکردووە.

لەم دونیایەدا هەمووشتێك كاتییەو مەحكومە بەگۆڕان، كەواتـە دەبێـت دونیایەك بوونی هـەبێت كـە هـیچ نـەگۆڕێت، ئـەو دونیایـەش ڕۆژی دواییـە لەڕێگەی مردنو گۆڕو ڕۆژی لێپرسینەوەوە پێـی دەگـەین. لـەو دنیایەشـدا كەسە باشـەكان بـە بەهەشـتی بـەرین شـاد دەبـن و، كەسـە خراپـەكانیش بەرەو دۆزەخ ڕاپێچ دەكرێن.

كەواتە دایكو باوكی تۆیش لە خۆشـی هـەتا هەتاییـدانو چـاوەڕێی تـۆ دەكەن.

## مردن چییە؟

پێش ئەوەی مامۆستاكەم قسەكانی تەواو بێت یەكێك لـەو پرسـیارانەی كە مەراقم بوو پرسیم:

–مـن هـیچ مـردنم خـۆش ناوێـت؟ ئەگـەر مـردن نەبوایـە چـەند خـۆش دەبوو، مردن چییە؟ بۆچی مردن هەیە؟

مامۆستاكەم لەبەرامبەر ئەو پرسـیارەی منـدا زەردەخەنەیـەكی كـردوو وتی:

–كچـی خـۆم... خـودا هـەموو شـتێكی لەبـەر حیكمـەتێكی دیـاریكراو دروسـتكردووە. هەنـدێك شـت هـەن كاتێـك سـەیریان دەكـەین بەڕواڵـەت ناشـیرینو نـاخۆش دەردەكـەون، بـەڵام لەڕاسـتیدا كاتێـك بەدوایانـدا دەگەڕێین یاخود بیریان لێ دەكەینەوە دەبینین بـەو جـۆرە نـین كـە ئێمـە بیرمان لێ كردوونەتەوە.

مـردنیش یەكێكـە لـەو شـتانە لەیەكـەم ڕوانینـدا ترسـناك و، ناشـیرین دەردەكەوێت.

"هەرچەندە مردن لە ڕواڵەتدا تاریك و، ڕەش و، ناشیرینە، بەڵام سیما ڕاستەقینەکەی بۆ موسوڵمانان نوورانی و جوانە، لەبەر ئەوە پێویستە بەچاوی ترسەوە نا بەڵکو بەچاوی خۆشەویستیەوە لە مردن بڕوانرێت"بریسکەکان.

چونکە مردن، ڕزگاربوونە لە ئەرکەکانی ژیان. شوێنێکە بۆ گۆڕانی جەستە. بانگهێشتێکە بۆ ژیانێکی هەمیشەیی. سەرەتایەکە بۆ گەیشتن بە ژیانی هەتا هەتایی.

هەروەك چۆن مرۆڤ لەسایەی هێزو دەسەڵاتێکەوە دێتە دونیاوە هەر بەو شێوەیەش لەسایەی هێزو دەسەڵاتێکەوە لە دنیاش دەر دەچێت، ئەم ڕاستیەت بە نموونەی ڕووەکەکان بۆ دەهێنمەوە کە ساکارترین زیندەوەرن. لەڕاستیدا مردنی هەر ڕووەکێك هەروەك ژیانی ڕووەکەکە ڕووداوێکی مەزنە، هەروەك چۆن مردنی میوەیەك یاخود ناوکێك نیشانەی چەندەها کارلێکی کیمیاییە، هەویر ئاسا لەژێرخاکدا دەشێلرێتو دەبێتە دەستپێکی ژیانێکی تازە، ئەمە لەکاتێکدایە کە مردنی تۆو چوونە ژێر خاکی واتای دەست پێکردنەوەی ژیان هەڵدەگرێت.

جا ئەگەر مردنی ڕووەك – کە لە نزمترینی چین و پلەکانی ژیاندایە– بەدیهاتوویەکی ئاوا ڕێك و پێك و پڕ لە دانست بێت، دەبێت مردنی مرۆڤ چۆن بێت کە خاوەنی بڵندترین چینەکانی ژیانە؟ هەروەك چۆن تۆوێك کە دەچێتە ژێر خاکەوە دەبێتە سومبولی بەهار، هەر ئاواش مرۆڤێك کە دەچێتە ژێر گڵەوە، لەبەهاری قیامەتدا پێدەگات."مەکتوبات

مردن سەرەتایەکە بۆ خۆشی هەتاهەتایی ئەگەر لەم بارەوە سەیری بکەین ئەوا مردن گەورەترین نیعمەتە، چونکە ئەو پەیوەندییەی کە بۆ

گەیشتن بەنیعمەتێکی خۆش ئەویش بەهەمان ڕادەی نیعمەتەکە خۆشەویستە.

بەکورتی مردن حەقێکە لەسەر هەر دروستکراوێك کە خاوەن ژیان بێت، بۆ هەموو کەسێك ژیانی گۆڕ هەیەو بیەوێت یان نا، هەر دەبێت بچێتە ناوی، ژیانی ناو گۆڕ بەپێی بیروباوەڕی مرۆڤەکان بەسەر سێ جۆردا دابەش دەبێت:

یەکەم: گۆڕ بۆئەو کەسانەی کە ئەهلی ئیمانن دەرگایەکە بۆ دونیایەکی زۆر لەم دونیایەی ئێمە خۆشتر.

دووەم: بۆ ئەو کەسانەی کە باوەڕیان بەدواڕۆژ هەیە بەڵام لە گومڕایی و سەر لێشێواویدا ژیان بەسەر دەبەن، دەرگایەکە بۆ زیندانیەکی هەتا هەتایی. هەنگاوی یەکەمە بەرەو مەحکوم بوون و دابڕان لە هەموو دۆستان.

سێیەم: بۆ ئەو کەسانەی کە باوەڕیان بە ڕۆژی دوایی نیە بۆ ئینکارو سەر لێشێواوەکان دەرگای لەسێدارەدانە، هەروەها پەتی سێدارەیە هەم بۆخۆیو هەم بۆ خۆشەویستانی. لەبەر ئەوەی خودی خۆی وا دەیبینێت هەر بەو شێوە سزا دەدرێت."وتەکان.

کەسێك کە باوەڕی بەخوداو ڕۆژی دوایی هێناوە، مردن بلیتێکی گەیشتنە بەخۆشەویستانی و، پێویستە بەخۆشەویستیەوە لە مردن بڕوانێت، چونکە مردن نیعمەتێکی زۆر گەورەیە لەلایەن خوداوە.

## ڕۆح چییە؟

ڕۆح چییە؟ دروستکراوێکی چۆنە؟ ڕۆح لەناو ئێمەدایە؟! ئەگەر وایە لەکوێماندایە؟ پاشانیش ئایا ڕۆح دەمرێت؟

لەبەرامبەر ئەم پرسیارانەی مندا مامۆستاکەم بەم شێوەیە وەڵامی دامەوە:

-ڕۆح ئەو دروستکراوەیە کە ژیانمان پێ دەبەخشێت بەدەست ناگیرێتو بەچاویش نابینرێت.

ڕۆح وەك جەستە نامرێت، ئەو نەمرە واتە خوای گەورە پێش ئەوەی کائینات دروست بکات ڕۆحەکانی ئەفراندووە دواتریش جەستەی کردوون بەبەرداو بۆ دونیای ناردوون.

ڕۆح بەجەستەوە نا بەڵکو جەستە بەڕۆحەوە بەندە. لەگەڵ ئەوەشدا ئەگەر ڕۆح بڵاو ببێتەوەو پاشانیش دووبارە کۆببێتەوە هیچ جۆرە گۆڕانکاریەك تیایدا ڕوونادات. تەنانەت دەتوانین بڵێین جەستە هێلانەو لانکەی ڕۆحە نەك بەرگی.

کەواتە لەکاتی سەرەمەرگدا ڕۆح بەتەواوی بێ بەرگ نیە لەهێلانەکەی دەر دەچێت بەڵام لەلایەکی دیکەیشەوە بەرگە واتاییەکەی دەپۆشێت. (وتەکان)

هەرچی سەبارەت بەنەمری ڕۆحیشە: هەموو ئەو شتە فانیانەی دونیا کە هەن بناغەی دروست بوونیان لەبەیەك گەیشتنی زیاتر لەمادەیەك یاخود هەزارەها مادە دەبێت. بەو هۆیەوە ئەو شتانەی کە لەیەك جیاوازن تەنانەت زۆر جار ئەوانەشی کە دژ بەیەکن ئیحتیمالی لەیەك جیابوونەوەیان هەیە. وەك لە قورئاندا هاتووە، ڕۆح لەو مەخلوقاتانەیە کە بە فەرمانی

خوای گەورە پەیدابووەو، هەر خوا خۆی دەزانێت چییە، مرۆڤ ئەندازەیەکی کەم نەبێت زانیاری پێ نەدراوە لەو بارەیەوە.

– ئایا مرۆڤ لەکاتی مردنو دەرچوونی ڕۆح لە لاشە ئازاری پێ دەگات.؟! واتە مردووەکان لەکاتی مردندا هەست بەئازار دەکەن؟!

لەبەرامبەر ئەم پرسیارەشمدا مامۆستاکەم پاش کەمێك وەڵامی دامەوە:

– ئەوە پەیوەستە بەوەی ئایا ئەوان بەندەیەکی باش یاخود خراپن، واتە بەپێی کردەوەکانیانە. ئەگەر ئەو کەسەی کە دەمرێت بەندەیەکی خۆشەویست بێت لای پەروەردگار ئەوا هیچ کات ئازاری پێ ناگەیەنێت. وەك ئەوەی لەژوورێکەوە بچێتە ژوورێکی ترەوە ئەوەندە ئاسان دەبێت، بەتایبەت ئەگەر مردووەکە شەهیدبێت هەست بەهیچ ئازارێك ناکات.

بێگومان بۆ شەهیدبوونیش پێویستە تەمەنو جەستەت لەپێناوی خودا فیدابکەیت، جیالەوەش هەرکەسێك لەئاودابخنکێت، لە ئاگردا بسوتێت، لەژێر گڵدا وەفات بکات، ئەگەر باوەڕداربێت، ئەوا بەشەهیدی مەعنەوی حساب دەکرێت، ئەویش لەکاتی سەرەمەرگدا ئازار ناچێژێت.

## ئیزرائیل! چۆن دەتوانێت لەیەك کاتدا ڕۆحی چەندەها کەس بکێشێت؟!

–مامۆستا، ئیزرائیل ڕۆحی مرۆڤەکان دەکێشێت وانیە؟!

–بەڵێ کچی خۆم، ئیزرائیل فریشتەیەو فەرمانەکانی پەروەردگار جێ بەجێ دەکات، ئازاری ئەو کەسانە نادات کە خوا دەناسنو خۆشیان دەوێت. بەڵکو لەکاتی سەرەمەرگدا ئازاری ئەو کەسانە دەدات کە سەرپێچی کارنو گوێبیستی فەرمانەکانی پەروەردگار نابن.

لەكاتی سەرەمەرگ یاخود لەكاتی بینینی ئیزرائیلدا تەنهاو تەنها كەسە گوناهـ كارەكانو سەرپێچی كارەكان تووشی ترس و دڵەڕاوكێ دەبن، مرۆڤە ئیماندارەكان هەروەك چۆن لە دونیادا بە جوانی لە مردن دەڕوانن، لەكاتی سەرەمەرگیشدا فریشتەی گیان كێشان بەجوانترین شێوە دەبینن و، تووشی هیچ مەترسیو ناخۆشییەك نابن.

كاتێك دەمبینی مامۆستاكەم بەوەڵامدانەوەی پرسیارەكانم دڵم ئاسوودە دەكات دەستم بەپرسیاری تر كرد كە دەهاتن بەمێشكمدا مامۆستاكەشم خودا خێری بنوسێت بۆ ئەوەی بێزاربێت وەڵامی دەدامەوە.

—فریشتەی گیان كێشان (ئیزرائیل) یەك دانەیە وانیە؟

—بەڵێ.

—باشە كە یەك دانەیە!! ئەگەر لەیەك كاتدا چەند كەسێك پێكەوە بمرن یەك فریشتە چۆن دەتوانێت گیانی ئەو هەمووە بكێشێت؟

مامۆستاكەم دووبارە زەردەخەنەیەكی بۆ كردم:

—كچە كاڵەكەم، تۆ بەڕاستی بیر لەم شتانە دەكەیتەوە؟

—وتم بەڵێ.

—وتی تۆ زۆر زیرەكیت، وەك ئەوەی كەسێكی گەورەبیتو بچووك بوبیتەوە ئەم پرسیارانەی تۆ نەك بەمێشكی منداڵێكی وەك تۆ بەڵكو بەمێشكی زۆرێك لەئینسانی پێگەیشتووشدا نایەت.

باوەڵامی ئەم پرسیارەشت بدەمەوە:

فریشتەكان لە نوور دروستكراون، واتە لەیەك كاتدا دەتوانن لەچەند جێگەیەك بن، هەروەك خۆر، خۆر لەیەك كاتدا دەتوانێت بگاتە هەموو

شوێنێکی دونیاو ڕووناکی بکاتەوە، تەنانەت دەچێتە ناو چەندین تەنی درەوشاوەوەو لەیەك کاتدا چەندەها خۆر دروست دەبێت.

هەروەها فریشتەی گیانکێشان (ئیزرائیل)، چەندین فریشتەی یاریدەدەری هەیە کە خوای گەورە ڕایسپاردوون بەو کارە. سەبارەت بەم بابەتە بەدیعوززەمان مامۆستا سەعیدی نوورسی بەم شێوەیە دەدوێت:

"فریشتە بالآدەستەکان وەك ئیزرائیل، میکائیل، جوبرەئیل، ئیسرافیل، وەك چاودێرێکی گشتی وانو لەپێگەی بەڕێوەبەرایەتی دان، لەچەشنی خۆیانو هاوشێوەی خۆیان بەلآم لەشێوازی بچوکتردا چەندین فریشتە هەن کە یاریدەدەریان دەکەن، ئەگەر لەم ڕووەوە بڕوانین دەتوانین بڵێین کە حەزرەتی ئیزرائیل (علیه سلام) چاودێری ڕۆح کێشان دەکات لەلایەن فریشتە بەرپرسیارەکانەوە، لەلایەکی تریشەوە بەپێی جۆری زیندەوەرەکان ئەوانیش دەگۆڕێن تەنانەت فریشتەی تایبەت بە گیان کێشانی کەسە باشەکان لەگەڵ کەسە گوناهبارەکاندا جیاوازە". مەکتوبات.

## ئێمە لەناو گۆڕدا ناترسین؟

–کاتێك دەمانخەنە نێو گۆڕەوە چۆن لەوێ دەمێنینەوە؟ ناترسین؟!

–گۆڕ، بۆ مردوو یەکەمین وێستگەی سەفەرەکەیەتی، ئەوێ بۆ ئەو بەندانەی کە باوەڕدارن باخچەیەکە لە باخچەکانی بەهەشت، بەلآم بۆ مرۆڤە بێ باوەڕەکان چاڵێکە لە چاڵەکانی دۆزەخ.

مرۆڤی باوەڕدار لە گۆڕ ناترسێت، چونکە بەهەزارەها فریشتە لەشێوەی دۆستو هاوڕێیانیدا دێنە سەردانی.

وەڵامەکانی مامۆستاکەم دانەدانە مەراقەکانمی دادەمرکاندەوە، بە گوێبیستبوونی وەڵامی ئەو پرسیارانەی کە ساڵانێك بوو خەریك بوو مۆخیان دەخواردم هەستم بە ئاسوودەییەکی زۆر دەکرد، لەبەر ئەوەش بەردەوام بووم لە پرسیار کردن.

–کاتێك دەمانخەنە نێو گۆڕەوە یەکەم شت ڕوو بەڕووی چی دەبینەوە؟

–کاتێك دەمان خەنە نێو گۆڕەوە یەکەم شت ڕووبەڕووی دوو فریشتە دەبینەوە بەناوی (نەکیر و مونکەر) کە دوو فریشتەی لێپرسینەوەن، یەکەم لێپرسینەوەمان لەلایەن ئەوانەوە دەبێت.

–زۆر قورس دەبێت؟!!

مامۆستاکەم بەپرسیارەکەمدا تێگەیشت کە ترساوم بۆیە وتی:

–نانا نەخێر، مرۆڤەکان بەپێی کردەوەکانیان لەژیانی دونیادا لێپرسینەوەیان لەگەڵ دەکرێت، بێگومان بۆ ئەوانەی چاکەیان لەگەڵ خەڵکی کردووەو فەرمانەکانی خودایان جێ بەجێ کردووە قورس نابێت.

سەبارەت بەم بابەتە بەدیعوززەمان بەم شێوەیە دەدوێت:

"وەك هەموو کەس منیش دەچمە ناو گۆڕەوە" جارێك بەخەون چوومە ناو گۆڕەکەم خەریك بوو لەتەنیایی و، بێ کەسی و، تاریکیو سەرماکەی ناوی بترسم لەناکاو دوو هاوڕێی موبارەك بەناوی نەکیرو مونکەر هاتنەلام و، لەگەڵم دەستیان کردە مێزگرد، دڵ و گۆڕەکەیان فراوان کردمو پڕیان کرد لە نوور خستیانە جووڵە، پەنجەرەکان بەرەو ڕووی جیهانی ڕۆحەکاندا کرایەوە منیش هەروەك ئەو خەیاڵەم بەڕاستی دەبینی بەهەموو بوونمەوە خۆشحاڵ بوومو سوپاس گوزاریم کرد.(تیشکەکان)

## خۆزگە مردن نەدەبووا

-باشـە ئەگـەر مـردن و، گـۆڕ و، بەهەشـت و، دۆزەخ نەبونایـە و، مرۆڤـەکان بـێ خـەمو خەفـەت و بـێ تـرس بژیانایـە، ئـەو کاتـە باشترنەدەبوو؟!

مامۆستاکەم لەبەرامبەر ئەم پرسیارەشدا وەڵامی زۆر جوانی دامەوە:

-بەپێچـەوانەوە... ئەگـەر بـاوەڕ بـوون بـەڕۆژی دوایـی و، بەهەشـتو دۆزەخ نەبوایـە مرۆڤـەکان لـە هـیچ شـتێك نەدەترسـان و یـەکتریان دەچەوساندەوەو حـەق‌و حقوقیـان نـەدەزانی و ژیـانی کۆمەڵگـە دەبـووە کێشمەکێش و ململانێ، تەنها شتێك کە دەتوانێت مرۆڤـەکان لەبەرامبـەر خراپەکاری بوەستێنێت باوەڕ بەڕۆژی دواییە.

بەدیعوززەمان بەم شێوەیە باس لەم بابەتە دەکات:

"منداڵان کە نزیکەی چواریەکی دانیشتوانی زەوی پێك دەهێنن، کاتێـك ڕووبـەڕووی هـەرجۆرە لەدەسـتدانێك دەبـن تووشـی پەژارەیـەکی گـەورە دەبن‌و بەجۆرێك کاریگـەر دەبـن کـە لـە ڕۆح و دڵـە بچووکەکانیاندا برینـی مەعنـەوی دروسـت دەبێـت و، تـەنها چارەسـەرێك بـۆ ئـەو برینانـە بـیری هەبوونی بەهەشتە.

دڵە پاکەکەی هەمیشە دەڵێت: "ئەو برایەم یاخود هاوڕێیەم مـرد بـەڵام بوویـە چـۆلەکەی بەهەشـت، لـە ئێمـە زیـاتر کـەیف خۆشـەو دەگـەڕێت، دایکیشـم کۆچـی دوایـی کـرد، بـەڵام بەڕەحمـەتی خـودا چـوو، دووبـارە لەبەهەشتدا دەگەڕێمەوە باوەشی پڕ خۆشەویستی ئـەو و دەیبینمـەوە و، بەدرێژایی ژیانی بەشێوەیەك دەژی کە شایەنی ئینسانیەت بێت.

دووبارە "پیرو پەککەوتەکان کە چواریەکی دانیشـتوان پێـك دەهێـنن، تاکە دڵ نەواییەك بۆ ئەوان لەبارەی کۆتایی هـاتن بـەژیانیان‌و چـوونە ژێـر

گلّ و کۆتاییی هاتنی جوانیو خۆشییەکانی دونیا بۆیان تەنهاو تەنها لە ئیماندا دەست دەکەوێت".

بە ئاواتی بەهەشتەوە دەتوانن بەرگەی ناڕەحەتیو سەختییەکانی ژیان بگرن، ئەمە بیروباوەڕێکی لەم جۆرەیان پێدەبەخشێت:

"خەفەت مەخۆن، ئێوە لاوێتییەکی هەتا هەتاییتان هەیە ژیانێکی پرشنگدارو تەمەنێکی نەبڕاوە چاوەڕێتانە... هەموو ئەو چاکانەی کە کردووتانە بۆتان پارێزراوەو، پاداشتەکەشی وەردەگرن"

گەنجەکانیش کە بەشێکی زۆری دانیشتوان پێك دەهێنن لە تەمەنێکدان کە ئارەزوویان لەوپەڕی جۆشو خرۆشدایە، ئەگەر شکست خواردن لەبەردەم هەستەکانیان هەیەو بەڕادەیەکی زۆر چاو نەترسن، تاکە هۆکارێك کە لە هەڵە و گوناه کردن بیانگرێتەوە باوەڕیانە بە هەبوونی دۆزەخ.

گەنجێك کە خاوەنی ئیمانێکی وەها بێت لەکاتی ئەنجامدانی هەر هەڵەیەکدا بەخۆی دەڵێت:

"ئەگەرچی دارودەستە و پۆلیسەکانی حکومەت من نابینن‌و دەتوانم خۆمیان لێ بشارمەوە بەڵام فریشتەکانی پادشایەکی خاوەن دەسەڵاتو خاوەن دۆزەخ دەمبینن‌و خراپەکانم دەنووسن".

دووبارە مرۆڤە نەخۆش و، ستەم لێکراو و موسیبەت دارەکان کە بەشێکی زۆری مرۆڤەکان پێك دەهێنن، باوەڕیان بەڕۆژی دوایی و بەهەشت وەك دڵنەواییەك دەبێت بۆیان بۆ ئەمەش هەموو ئەو ئازارانەی کە چەشتویانە، ئەو ستەمانەی کە لێیان کراوە، هەروەها ئارامگرتن لەسەر زوڵم حەواڵەی خودا دەکەن.

کاتێك دەچمە سەر گۆڕی دایکم گوێبیستی قسەکانم دەبێت؟!
کۆتا پرسیاریشم لە مامۆستاکەم بەمشێوەیە بوو:
-کاتێ من دەچمە سەر گۆڕی دایکم ئایا ئەو گوێ بیستی من دەبێت؟!
مامۆستاکەم لەم پرسیارەم زۆر خەفەت دای گرت.
-بەدڵنیاییەوە کچی خۆم، چۆن گوێی لێت نابێت!
تەنها کاتێك دەچیتە سەر گۆڕی دایکت مەگری. بەڵام دوعای بۆ بکە.
کاتێك کەسێك دەچێتە سەر گۆڕی ناسراوێکیو سڵاوی لێ دەکات، مردووەکە ئەو دەناسێتەوەو سەلامەکەشی وەردەگرێتو ئەگەر کەسێکی نەناسراو بچێتە سەرگۆڕی کەسێكو سەلامی لێ بکات، دووبارە مردووەکە سەلامەکە وەردەگرێت.
پێغەمبەری خواﷺ دەفەرموێت: "مردووی ناو گۆڕ وەك کەسێك وایە کە خەریکە دەخنکێتو داوای یارمەتی دەکات، بەردەوام چاوەڕوانی دوعای دایك و باوکی و، خوشك و براکانی، یاخود هاوڕێکانێتی، کاتێك دوعایەکی پێ دەگات، ئەوا لە هەموو جوانیەکانی دونیاو هەرچی تیایە پێی خۆشترە. بێگومان جوانترین دیاری زیندووەکانیش بۆ مردووەکان تەنها دوعا کردن و داوای لێخۆشبون کردنە بۆیان.
مەبەست لە زیارەتی مردوو، هەروەك چۆن پەند وەرگرتنە بۆ زیندووەکان هەرواش مەبەست لێی وەرگرتنی دوعای خێرە بۆ مردووەکان.
مامۆستاکەمم زۆر هیلاك کردبوو، بەڵام وەڵامەکانی ئەو کێشمەکێشمەکانی منی چارەسەرکرد، خەمەکانم ڕەوینەوە، سەبارەت بەدایكو باوکم زۆرتر ئاسوودەبووم، جگەلەوە ئومێدی بوونی ئەوان لەبەهەشت ئاسوودەییەکی زۆرتری پێ دەبەخشیم.

# بەشی شەشەم

## نەگبەتیەکان تەواو نەدەبوون...
## مامۆستا سیڤگیشم لەدەست چوو

**پوختەی ئەم بەشە**

ئەو مامۆستا سیڤگییەی کە وەکو منداڵی خۆی سۆزو میهرەبانی پێ دەدام و تەنهایی بیربردمەوە، لە ڕووداوێکی پڕ تراژیدیدا بووە قوربانیی. دیسان لەناو ئازاردا تەنها کەوتمەوە. خودایە حاڵی من چی بەسەردێت؟ تەنها هاوڕێم فرمێسکە ڕژاوەکانی چاوم بوون کە نەدەگیرسانەوە.

# هەمیشە دایکم لە خەونمدا دەبینی

دابڕان لە دایکم بەڕادەیەك پەرێشانی کردبووم کە ئاگری ناخم نەدەکوژایەوە، هەموو شەوێك ئەوم لەخەونمدا دەبینی.

لە هەندێك لەخەونەکانم دا، دایکم دەستی دەگرتمو بۆلای باوکمی دەبردم، بەڵام هیچ کات نەمان دەتوانی بیگەینێو بەخەبەر دەهاتم.

تا بەیانی دەگریام، چونکە هەمیشە لەنزیك دایکمەوە دەنوستم. بەتەنهایی ڕانەهاتبووم لەبەرئەوە چەندەها شەو بێ خەو و بەترس و فرمێسکەوە ڕۆژم کردوەتەوە. خوا هیچ کەسێك بێ دایك نەکات.

دووبارە لەخەونێکی ترمدا دایکم هات ئای خوایە ئەوەندە پاك و پرشنگداربوو هەروەك فریشتە لەباوەشی گرتم، هەستم بەبۆنی خۆشی دەکرد کە هەروەك میسك وابوو. وتم:

– دایە، بۆچی منت جێ هێشتو ڕۆشتیت! !

وتی:

–من نەڕۆشتووم کچەکەم، بەڵام تۆ من نابینیت.

–واتە... تۆ نەمردوویت! !

–نەخێر کچەکەم من شەهیدبووم.

–باوکیشم شەهیدبووە؟

–بەڵێ کچم... ئەویان لەبەندیخانە بێ تاوان کوشت و ئەویش شەهیدە دووبارە بەگریانەوە خەبەرم بویەوە.

یەکێکی تر لەو خەونانەی کە زۆر کاری تێکردم بەم شێوەیەی بوو:

دووبارە لەخەونەکەمدا لەباوەشی دایکمدا بووم، لەبەردەم خانوویەکی زۆر ڕازاوەدا، بەڵام دووبارە باوکمی لێ نەبوو، من باوکمم دەویێت.دایکم وتی:

—تۆ خەفەت مەخۆ لەبەر نەهاتنی ئەو.

وتم:

—ئەم خانووە هی کێیە؟

—ئەم خانووە پێغەمبەرﷺ پێی بەخشین، لێرە بۆ شەهیدەکان خانووی تایبەتی هەیە.

خانوویەکی ئەوەندە جوان بوو کە پێی سەرسام بووم بەڵام کاتێک خەبەرم بوویەوە دووبارە شیوەن و گریان دەستیان پێ کردەوە.

## یەکەمی هۆنراوە نووسین بووم:

لە پۆلی پێنجی سەرەتایی بووم. لەنێوان قوتابخانەکانی شارۆچکەکەماندا پێشبڕکێی هۆنراوە کرا، منیش هۆنراوەیەکم بۆ دایکم نووسی، بەڵام ئەوەندە بەتایبەتی خۆم بۆ ئەو هۆنراوەیە ئامادەکرد بوو بەشێوەیەك وام هەست دەکرد دەگاتە دەستی دایکم ئەمە لەکاتێکدا کە من بەهرەی هۆنراوە نووسینم نەبوو، ئەوە یەکەم جارم بوو هۆنراوە بنووسم.

بە هاوکاری مامۆستا سێڤگی هەموو هەستەکانم ڕژاندە نێو دێڕەکانەوە لەگەڵ ئەوەشدا هەموو ڕستە و وشەکانی هۆنراوەکەم بەفرمێسکەکانم تەڕ بووبوون.

کاتێـك مـرۆڤ دەچـێتە نێـو ئـەو جـەوە پـڕ لەهەسـتەوە شـتی زۆر سەرنجڕاکێش دێنێتە کایەوە. واتە هەم گریام و هەم هۆنراوەکـەم نووسـی. بیستوتانە دەڵێن ئەو کتێبانەی بەگریانـەوە دەنووسـرێن، خوێنـەرەکانیش دەخەنە گریان!

هۆنراوەکە تەواو بـوو، دامـە دەسـت مامۆسـتا سـێڤگی بینـیم دەسـتی بەگریان کرد.

وتی:

—زۆری بیر دەکەیت وانیە کچەکاڵەکەم!!

باوەشمان بەیەکدا کردو دەستمان بەگریان کرد.

بیرکردن چ وشەیەکە! ئەگەر پێم بڵێن ڕۆحت ببەخشە بەخۆشـحاڵیەوە دەیبەخشم.

ڕۆیشـتم بـۆ لای لیژنـەی هەڵسـەنگاندنی هـۆنراوە... هۆنراوەکـەیان خوێندبوویەوە لەوێ کەس نـەمابوو بەبیسـتنی هۆنراوەکـە نـەگریی. دواتـر بەڕێوەبەری پەروەردە بانگی کردم، منیان بردە لای وتی:

—کچەجوانەکە تۆ چ خۆشەویسـتیو سـۆزێکت هـەڵگرتووە لەناختـدا وا ئێمەت خستە گریان.

زۆر دڵنەوایی کردم، دیاری پێ بەخشیم و پێداویستییەکانمی دابین کـرد وتی:

—لەمەودوا منیش مامۆستای تۆم، هەرچی داواکارییەکت هەبێت بەخۆم دەڵێیت منیش هاوکاریت دەکەم.

خودا لێی ڕازی بێت دڵـی دامـەوە، هۆنراوەکەشـم یەکـەم دەرچـوو لـە قوتابخانەکەمان ئاهەنگێك سازکرا، لەئاهەنگەکەدا، پارێزگـار، بەڕێوەبـەری

پەروەردە، بەڕێوەبەری ئاسایش، بەڕێوەبەری شارەوانی و، کۆمەڵێکی تر لەکەسە ناودارەکانی شارۆچکەکە ئامادەبوون.

سەرەتا بەڕێوەبەری قوتابخانەکەم هۆنراوەکەی منی خوێندەوە...

بابڵێین خوێندیەوە... لەڕاستیدا نەیخوێندەوە بەڵکو لە سەرەتاوە تاکو کۆتایی دەگریا، لە ئاهەنگەکەدا کەسی تێدا نەما کە نەگری.

پارێزگار منی لەباوەش کردو ماچی کردم لەو کاتەدا چاومان چووە سەر چاوی یەك بینیم لەنێوان برژانگەکانیەوە فرمێسك دڵۆپ دڵۆپ دەهاتە خوارەوە. وتی:

– سەبارەت بەتۆ زانیاریم وەرگرتووە کچەکەم من لێرە بەدواوە دەبمە باوکی مەعنەوی تۆ، ئەمە ژمارەکەمە کەی لە تەنگانەدا بوویت، هەر کاتێك پێویستیەکت هەبوو تەلەفۆنم بۆ بکە یەکسەر دەگەمە فریات.

هەموو ئەوانەی لە ئاهەنگەکەدا ئامادەبوون هەمان شتیان دووبارە دەکردەوە، پارێزگار جانتایەکی گەورەی پێدام، هەروەها زەرفێکی بچووکیشی پێدام جگە لەوەش لەبەرئەوەی یەکەمی هۆنراوە نووسین بووم پلاکێتیشیان پێدام.

زۆر دڵخۆش بووم زۆر... یەکەمجار بوو هێندە بە خۆشحاڵییەوە هەنگاو بنێم، هەستی خۆشبەختی چەندە خۆشە!

بێگومان مامۆستا سێڤگیو بەڕێوەبەری قوتابخانە لەگەڵمدا زۆر دڵخۆش بوون ئەوان ئەوەندە ئەجریان لەسەرم هەبوو وەك کچی خۆیان تەماشایان دەکردم.

ئەو جانتایەی کە پێیان دابووم پڕبوو لەجلو بەرگ و دیاری، دیاربوو پرسیاریان لەکەسێك کردبوو کە منی بەباشی دەناسی، لەوانەیە ئەو کەسە مامۆستا سێڤگی بوبێت، چونکە پۆشاکەکان لەو ڕەنگو مۆدیلانە بوو کە

من حەزم لیّ دەکرد، ڕەنگیشە مامۆستا سێڤگی هەموویانی کڕی بێت تا ئێستا ئەوەم بۆ ڕوون نەبوەتەوە.

ئەوەی ناو زەرفەکەش پارە بوو، بەپێی وەزعی ئەو ڕۆژانە پارەیەکی باش بوو، مامۆستا سێڤگی خوا لێی ڕازی بێت نەیهێشت ئەو پارانە سەرف ببێت، دای بەئاڵتون‌و بازن بۆم بەم شێوەیە هەم منی دڵخۆش کرد هەم نەشی هێشت پارەکە خەساربببێت.

ئای... لەو ڕۆژانە. چەندە دڵخۆش بووم، دەتوانم بڵێم ئەو ڕۆژانە یەکەمین‌و تاکە ڕۆژی خۆشی ژیانم بوو.

## دڵخۆشییەکەم زۆری نەخایاند:

تا پۆلی سێی ناوەندی لەژێر باڵی پرسۆزو میهری مامۆستا سێڤگی دا ڕۆژانێکی زۆر خۆش ژیام، هەرچەندە هیچ شتێك ناتوانێت حەسرەتی لەدەستدانی دایك‌و باوك نەهێڵێت، بەڵام مامۆستا سێڤگی بۆنەوەی هەست بەنەبوونیان نەکەم چی لەدەست بهاتایە دەی کرد.

ئێستا بیری لیّ دەکەمەوە ئەو فیداکاریانەی ئەو دەیکرد لەم دونیایەدا کەم کەس دەتوانن بیکەن.

خوای گەورە وەك سۆزێکی گەورە، مامۆستا سێڤگی بۆ من ناردبوو، خەریك بوو ناوەندیم تەواو دەکرد، گەیشتبومە تەمەنێك کە عەقڵم بەزۆر شت دەشکا، بەواتایەکی تر هەنگاوێکم دەنا بەرەو گەنجێتی، بۆ ئەوەی زیاتر نەبمە ئەرك بەسەر مامۆستا سێڤگی‌یەوە تاقیکردنەوەیەکم ئەنجامدا بۆ ئەوەی لە بەشی ناوخۆیی وەربگیرێم و لەو تاقیکردنەوەیەدا دەرچووم.

بڕیارمدابوو قۆناغی ئامادەیی لەبەشی ناوخۆیی تەواو بکەم، لەبەرئەوەی حکومەت پێداویستی‌یەکانی قوتابخانەو شوێنی حەوانەوەو خۆراکی دابین

دەکرد بەمەش ڕزگارم دەبوو لەوەی کە ببم بەئەرك بەسەر مامۆستا سێفگی‌یەوە.

هەرچەندە مامۆستا سێفگی نەیدەویست قبوڵی بکات، بەڵام من سوور بووم لەسەر بڕیارەکەم لەبەر ئەوەنا کە خۆشەویستیان بۆم کەم بوبێتەوە یان شتێکی لەو جۆرە، بەڵکو لەبەر ئەوەی لەگەڵ گەورەبوونمدا پێداویستیەکانیشم زیادیان دەکرد.

بەهاوکاری مامۆستا سێفگی لەقوتابخانە ناونووس کرام، شوێنی نوستنەکەم بینی، لەگەڵ بەڕێوەبەرو هەندێك لەمامۆستاکاندا یەکمان ناسی، جگە لەوەش مامۆستا سێفگی خودا لێی ڕازی بێت لەبارەی منەوە زانیاری تەواوی بە بەڕێوەبەر دابوو، بەڕێوەبەریش وتی:

-مادام وایە دەتوانین خەرجیشی پێ بدەین.

بەدڵنیاییەوە وای کرد.

لەبەر ئەوەی خوێندنگەکەی کە من لێم دەخوێند لەشارێکی تربوو، لەگەڵ مامۆستا سێفگی گەڕاینەوەو دەبوو ئامادەکاری بکەمو بگەڕێمەوە بۆ قوتابخانە.

## بەڵایەکی لەم جۆرە!!

مامۆستا سێفگی وەك دایکێکی دڵسۆز بەدرێژایی ڕێگا لەناو پاسەکەدا سەبارەت بەژیانە نوێیەکەم ئامۆژگاری بەنرخی کردم و ئاگاداری کردمەوە لەبارەی ئەوەی دەبێ چی بکەمو چی نەکەم.

بەتایبەتیش سەبارەت بە پەیوەندی نێوان کچ-کوڕ و بابەتی لەو شێوەیە دەدواو زۆر جەختی دەکردەوە.

ڕۆژی ڕۆیشتنم نزیك بووبوویەوە چیتر دەبوو لە مامۆستا سێڤگی‌و دادە نوریيەو سەعید کە وەك خوشکی خۆیان سەیریان دەکردم جیاببمەوە.

مامۆستا سێڤگی:

–با ئەمڕۆ بتانبەم بۆ سەیران، وردە وردە بەرەو زستان دەڕۆین ڕەنگە ڕۆژێکی دیکەی لەو جۆرەمان دەست نەکەوێت.

من تێگەشتبووم ئەو زیاد لەوەی مەبەستی سەیران بێت مەبەستی ئەوەبوو من کۆتا ڕۆژەکانم لەوێ بەخۆشی بەسەربەرم ئەمە چ تێگەیشتویەکە خوایەگیان!

خۆمان ئامادەکرد و بەخێرایی بەرەو شوێنێکی دارستانی دەرەوەی شار کەوتینەڕێ. لەکوێ بمانزانیایە ئەم ڕۆژە ناخۆشترین ڕۆژی ژیانمان دەبێت! لەکوێ بمانزانیایە ئەم سەیرانە پڕ لە ئازار دەبێت.

ئەو شوێنەی کە بۆی دەچووین شوێنێکی بەناوبانگ بوو، کۆتایی هەفتەکان ئەوانەی لەجەنجاڵی شار بێزاربوون دەهاتنە ئەوێ، لەبەرئەوەی شوێنێکی قەرەباڵغ بوو.

ڕۆشتین‌و شوێنێکمان بۆ خۆمان دیاری کرد.

جوانیەك کە مرۆڤی سەرسام دەکرد... هەوایەکی سازگار... سێبەرو کەپرو ئاوی ساردی وەك سەهۆڵ... ئیتر وەك هەوارێك بوو دەتوت خودا بەتایبەتی نەخشاندویەتی.

ئەو شوێنەی ئێمەی لێ بووین کەمێك لێژبوو، بەرزاییەکان بەدەیەها خەڵکی لێ بوو. ئەوانیش وەك ئێمە بۆ سەیران هاتبوون.

ماڵێك لەنزیکمانەوە بەلۆرییەك هاتبوون و لەتەنیشت لۆریەکە سەیرانیان دەکرد.

دەستمان کرد بەئامادەکارییەکانی سەیرانەکە.

مامۆستا سێڤگی، دادەنوریییە، منو سەعید هەریەك ئیشێكمان بۆ خۆمان هەڵبژاردو بەخۆشییەوە دەستمان كرد بەجێ بەجێ كردنی.

لەناكاو چاوم چووە سەر لۆریەكە، دوو منداڵ یاریان بەسوكانەكەی دەكرد لەبەر خۆمەوە بیرم كردەوە "ئەم لۆرییە نەیەت بەسەرماندا ڕووی لە ئێمەیەو ڕێگاكەش كەمێك لێژە" دەستمان بە ئامادەكارییەكان كردەوە.

زۆری نەخایاند خۆمان بەئیشەكانەوە مەشغوڵكردبوو كە:

یەكێك هاواری كرد:

–ڕاكەن هات.. خۆتان ڕزگاركەن...

هێشتا نەهاتبوینە سەرخۆمان تابزانین چی ڕوویداوە بینیمان لۆرییەكە بەخێرایی بەرەو ڕوومان دێت.

هەموومان شڵەژاین، بەشێوەیەك شڵەژابوین وەك ئەوەی دەستمان درێژكردبێت بۆ ئەوەی لۆریەكە بوەستێنین، ڕاكردن بەمێشكماندا نەدەهات، لەو كتوپڕیو شڵەژاوییەدا مرۆڤ عەقڵی دەوەستێت، نازانێت چی بكات.

مامۆستا سێڤگی لەتەنیشتمەوە بوو، لەو شڵەژاوییە گەورەیەدا بەخێرایی پاڵی بە منو منداڵەكانیەوە نا بەڵام خۆی ئەوەندەی ئێمە شانسی نەبوو.

لەو كاتەدا وام هەست كرد شاخێك كەوت بەسەرمدا هەستم بەدەنگە دەنگێكی زۆركرد.

قیژەو هاوارێكی زۆر قووڵ دەهات بەڵام تادەهات نزم دەبویەوەو نەما وام هەست كرد كەوتومەتە چاڵێكی قووڵەوە.

## ڕووداوێکی دڵتەزێن:

لەو کاتەدا چی ڕوویدا! بەکێیدا کێشا! کێی بەژێرەوە کرد! کەوتە گیانی کێ لەبیرم نایەت.

کاتێك چاوەکانم کردەوە بینیم چەندەها خەڵك لەدەورویەرم ڕادەکەن هاواریان تێکەڵ بەیەك بووە، هاوارو ناڵە دڵیان دەسوتاند، بەداخەوە ئەو ناوە بووبوو بە بازاڕی لاشە، ئەو سەوزاییە سیحراویانە بەخوێن سوور بووبوون.

لۆرییەکە بەسەر هەردوو قاچمدا ڕۆیشتبوو هەردوو قاچم شکابوو، ئاگام لە خۆم بوو برینی ترم نەبوو، لەو کاتەدا و لەناو ئەو قەرەباڵغیە زۆرەدا ئەوانی ترم نەبینیو دەستم بە هاوارکرد.

—چییان لێهات؟! ئەوان لەکوێن!

ژنێکی بەتەمەن لەتەنیشتم دانیشتو وتی:

—سوپاس بۆ خوا تۆ هیچت نیە.

خەریك بوو خۆم پارچە پارچە دەکرد دەموت: ئەی ئەوان؟!

کەس دەنگی لێوە نەهات، چاوەکانی ژنە بەتەمەنەکە پڕبوون لەئاو، فرمێسك بەگۆنایدا هاتنە خوارێ، بەدەنگێکی قووڵو پڕ ئازارەوە وتی:

—خودا ویستی وابوو کچم، ئیتر هیچ شتێك لەدەستی کەس نایەت.

لەو کاتەدا وام هەست کرد چەکوشێکی گەورەی بەسەرمدا کێشا.

لەبیرمە خەریك بوو خۆم لەناو دەبردو دەموت:

—واتە ئەوانیش مردوون؟!

ئەوەندەم زانی بۆ ناو چاڵێکی بێ بن خل بومەوە. هەموو شتێك تێکەڵ بوو هەموو بەیەکدا چووبوون هەموو لێڵو پڕ ئازاربوون.

مێشکم وەستابوو، نەمدەتوانی بیر لە هیچ شتێك بکەمەوە، وام دەزانی هەموو لاشەم بەستویەتی‌و ڕۆحم دەرچووە، مانای تەواوی ئەو قسانە وابزانم هەر ئەمە بوو "دونیا بەسەرمدا ڕووخا".

بەڵێ بەڕاستی لەو کاتەدا دونیا بەسەرمدا ڕووخابوو، منیش لەژێریدا گیانم دەدا. با باسی ڕاستی ڕووداوەکە بخەینە لایەوە، تەنانەت بیرکردنەوە لێی بەس بوو بۆ ڕووخان‌و لەناو چوونی من... چونکە ئەوان سەرچاوەی بوونم بوون، تەنها دۆستی ژیانم بوون، مردنی ئەوان واتای مردنی منیش بوو من نەمدەتوانی بێ ئەوان لەم دونیایەدا بژیم.

بەداخەوە هەر بەو شێوەیە بوو، ڕێك لەو کاتەدا کە لە خەیاڵی دڵخۆشی‌و ئارامی لاوێتیدا بووم، ڕووبەڕووی ڕووداوێکی سەخت بووینەوە کە هەموو ژیانمانی سەروژێر کرد.

لۆرییەکە لەبەرچاوی هەمووان و لەنێو سەرنجی پڕ سەرسامی ئەواندا مامۆستا سێڤگی کردبوو بەژێرەوە، دادە نورییە و سەعیدیش بە برینداری ڕزگاریان بوو.

مامۆستا سێڤگی، سەرباری جەستەی برینداری گیانی بە (الله أكبر)ەوە لەدەستدابوو، ئەو کەسانەی کە لەسەر سەری بوون سەریان سوڕمابوو لەبەردەم ئەو حاڵەی دا، ئەوەندە مردنێکی پڕ پەند بوو، لەکاتێکدا خوێن لەدەمی دەهاتە دەرەوە بەوتەی "خوایەگیان بۆلای تۆ دێم" کۆتا هەناسەی دا، ئەو کەسانەی ئەوێ بەسەرسوڕمان‌و عیبرەتەوە ئاگاداریی ئەو شەهادەت هێنانەبوون.

بێگومان ئەو خانمێکی فریشتە ئاسابوو، ئەو کە یەکێك بوو لە باشترینی خانمەکانی دونیا، بەدڵنیاییەوە بە (الله أكبر)ەوە دەگەڕایەوە

بۆلای خودا، خودای مەزن چۆن بەشێوازێکی تر دەجولایەوە لەگەڵ بەندەیەك خودای ئەوەندە خۆشدەویست!

بەهەموو دڵو هەستمەوە باوەڕم هێنابوو، مامۆستا سێڤگی کە وەك دایکێکی ڕاستەقینە وابوو بۆ من بەرەو مەقامێکی بەرز ڕێی سەفەری گرتەبەر.

## بووینە دراوسێی دایکت:

خەونێك کە لەو ڕۆژانەدا بینی بووم تەواوی هەستەکانمی پشت ڕاست کردەوە.

لەبەر ئەوەی قاچەکانم شکابوون لە نەخۆشخانە کەوتبووم، بەدڵنیاییەوە لە بێتاقەتیو بێزارییەکی زۆردابووم، بۆ تەنها ساتێکیش ئەو ڕووداوە ترسناکەم لەمێشك دەرنەدەچوو.

لە خەونمدا مامۆستا سێڤگیو منداڵەکانی هاتبوون بۆ سەردانم بۆ نەخۆشخانە. کاتێك لە دەرگاوە هاتنە ژوورەوە دەمو چاویان بەجۆرێك دەدرەوشایەوە کە ژوورەکە لەناکاو پڕبوو لە نوور، بەتایبەتی لەدەمو چاوی مامۆستا سێڤگی دا خۆشحاڵییەکی وا بەدی دەکرا کە لەبەرامبەریدا سەرم سوڕمابوو.

خۆم فرێدایە باوەشیان، منی بەسۆزەوە گرتە باوەشو لەسنگی توندکردم.

–کچەکەم، کچەکاڵەکەم ویستم تۆش بێنم بەڵام ڕێیان پێ نەدام.

بۆچی ئاوا دەگریت من زۆرباشم، زۆر دڵخۆشم، سەیرکە نەمردووم من لێرەم پاشانیش با هەواڵێکی دڵخۆشکەرت پێ بڵێم.

ئەوێ زۆر جوانە، بووم بە دراوسێی دایکت، بە بەردەوامی باسی تۆ دەکەین ئێمە زۆر دڵخۆشینو لە شوێنەکەمان ڕازین.

خەبەرم بوویەوە، بەڵام خۆزگە خەبەرم نەدەبۆوە.

دووبارە هەمان دونیا، دووبارە هەمان کێشە، دووبارە هەمان ئازار...

دەبوو بەردەوام لە بەرامبەر خەون و خەیاڵ و فرمێسکەکانمدا ئۆقرە بگرم.

دەزانن ئەمە مانای چییە؟ دەتوانن بیری لێ بکەنەوە؟

ئەم بەڵایە، چیرۆکی کچێکی گەنجەکە لە دونیادا بە تەنیا ماوەو بە دووقاچی شکاو و ترسەوە ژیان بەسەر دەبات.

تەنانەت بیرکردنەوە لێی مرۆڤ ڕادەچڵەکێنێ، وانیە؟!

خودایە ئەم ئازارانە تووشی کەس نەبن.

کاتێک من لە نەخۆشخانە بووم، خزمەکانی دایکیان دادە نورییەو سەعیدیان بردە لای خۆیان، ئەو ماڵئاواییەم هیچ کات لەیاد ناچێت نەیان دەتوانی لەیەکمان بکەنەوە، لەم دونیایەدا بەتەنیا مامەوە لەدوای ئەوەش زۆر هەوڵمدا بیان بینم، بەڵام قسمەت نەبوو بەدڵنیاییەوە ئەوانیش بەدوای مندا گەڕاون، من ئێستا نازانم ئەوان لەچ حاڵێکدان.!

## تا بەرەبەیان دەگریام:

تەنها دڵنەوایی من فرمێسکەکانم بوون، لەوە زیاتر هیچم لەدەست نەدەهات لە ڕۆژەکانی سەرەتادا لە پارێزگارەوە تا بەڕێوەبەری شارەوانی هەموان هاتن بۆ سەردانم و هیوای چاک بوونەوەیان بۆ خواستم، ئامۆژگاریان کردم و هاوکاریان بۆ دووپات کردمەوە، بەڵام زۆری نەخایاند و لەدوای ڕووداوەکەوە هەموو دەنگیان نەما و کەس ئامادەنەبوو دەرگام لێ بکاتەوە، تەنها بەڕێوەبەری قوتابخانەکەم نەبێت، خێری بنوسرێت بەردەوام ئاگاداری دەکردم و دەهاتە سەردانم.

خۆ ئەگەر بەڵێنەکانیان ببردایەتە سەرو گیرفانیان بەپارە پڕ بکردمایەو هەموو پێداویستییەکانیشمیان دابین بکردایە تاچەندێك دەیان توانی تەنهایی و برسێتی و ئازاری ڕۆح و دڵم برەوێننەوە؟!

لەبەیانی تا ئێوارەو لەئێوارە تا بەیانی سەرم بەسەرینەکەم دادەپۆشی، دەگریام فرمێسکم دەڕشت، تاکە دڵنەواییەکەم ئەوەبوو بەبەردەوامی دەپاڕامەوە لەخودا "خودایە یارمەتیم بدە"

هەندێك جاریش ئەوەندە لەحاڵێکی قورس و بێ چارەییدا بووم لەناخمدا دەستم بەسەرپێچی دەکردو دەمووت:

—بۆچی ئەم بەڵایانە بەسەر کەسدا نایەت من نەبێت، لەبەر چی؟!

کچێکی لاوی تەنهام، لەنێوەندی کۆمەڵە دەردێکی بێ شوماردا ئۆقرەم لێ بڕاوەو، کێشەو ناڕەحەتی دونیا وەکو شاخ دەوریان داوم و، داهاتوویەکی تاریك چاوەڕێم دەکات. چۆنتان دەوێت لەڕێگاکە بڕوانن، لەڕێگایەکدا بووم کە هیچ شوێن پێیەکیشی لێ نەبوو.

لەو ڕۆژانەدا بەڕێوەبەری قوتابخانەکەم دوو دارشەقی بۆ هێنام:

—لەمەودوا تۆ بەمانەوە هەوڵی ڕۆیشتن بدە کچی خۆم، هەفتەی داهاتوو قوتابخانە دەکرێتەوە من لەگەڵ بەڕێوەبەری قوتابخانەکەدا قسەم کردووە، ڕاپۆرتێکم پێشکەش کردووە، ئەگەر دە ڕۆژ درەنگتریش دەست بەدەوام بکەیت کێشە نابێت.

لێرە کەمێك زیاتر چارەسەر وەردەگریت، دکتۆرەکان دەڵێن کە حاڵی قاچەکانت باشن کاتێك چارەسەریش تەواو بوو خۆم دەتبەمو تەسلیم بە قوتابخانەت دەکەم.

بێ تاقەت نەبیتو بڵێیت کەسم نیە، بەهیچ شێوەیەك بەو جۆرە بیرنەکەیتەوە، لەمەودوا من هەم، مەگەر تۆ منت بەباوکی مەعنەوی خۆت قبووڵ نەکردووە؟

تۆ هیچ کات تەنیا نیت، تا کاتێك لەژیاندا بم هەمیشە لەگەڵتدا دەبم، لە پشووەکانیشدا دێم بەشوێنتداو دەت بەمەوە ماڵی خۆمان.

ئەگەر چی مامۆستا سێفگیش بەڕەحمەت چووبێت ئێمە وەك شاخ پشتو پەنات دەبین، خێزانم ئامادەیە تۆ وەك کچی مەعنەوی خۆی بگرێتە خۆی، دەزانی خۆ ئەو تۆی زۆر خۆش دەویست.

خودا لەو بەڕێوەبەرە ڕازی بێت. ئاوی کرد بەدڵمدا، خودای گەورە هەموو دەرگاکانی بەڕووی بەندەکانیدا داناخات، بەدڵنیاییەوە تروسکایی ئومێد هەر دەمێنێت.

بەڵام هێشتا دڵێکی پڕ لە ئازارو ڕۆژانێکی سەختتر چاوەڕێی من بوون، هێشتا تاقیکردنەوەی من تەواو نەبووبوو.

# بەشی حەوتەم

## دەستم بە دەوام کرد لەقوتابخانەکەم
## بەڵام گورگە برسییەکان بۆنیان کردبووم

**پوختەی ئەم بەشە**

کچێکی بێکەس کە قاچەکانی کەم ئەندام بوون، جوان و بێگەرد.. لەناو دەوروبەرێکی نەناسراودا.. لەبەرامبەر ئەو مەترسییانەی چاوەڕێ بوو بەسەری بێت، دەبوو چی بکات؟ هەنگاو هەنگاو بەرەو خراپەکاری ملم دەنا. ئەم ڕۆشتنەشم لەوە دەچوو کە نەگبەتیەکم بۆ ئامادە بکات.

مەترسیەکیش ئەو مژدەدەرە مەسیحیانەبوون، کە بە شوێنی منیان زانیبوو، کەوتبوونە دوام.

## دهستم به دهوام کرد لەقوتابخانەکەم

بەیارمەتی دارشەق و بەهەزار ماندوێتی دەستم بە دەوام کرد.

ژینگەیەکی تا بڵێ ی تازەبوو بۆ من، یەك بەندەی خوام نەدەناسی لەوێ، بەڵام بێگومان هەمووان منیان دەناسی.

کچە دارشەق بەدەستەکە!

هەموو چاوەکان لەسەر من بوون. چونکە من کچێکی شەل بووم. وابزانم بەشێکیش لەبەر ئەوەبوو کە زۆر جوان بووم، سەر دایکی ڕەحمەتیم دابویەوە، بەڵام تەنانەت کەسێکیشم نەبوو کە یارمەتیم بداتو ئاگری ناخم بڕەوێنێتەوەو هەڵگری نهێنیەکانم بێت.

چونکە تا ئەو کاتە قاچم چاك نەبووبوویەوەو لەنێو ئازاردا دەتلامەوە.

بەردەمم داهاتوویەکی نادیار بوو وام هەست دەکرد لەنێو تونێلی درێژی ژیاندام.

قوتابخانەکەمان زۆر گەورەبوو.. لەشوێنی نوستنیش هەشت کچ دەماینەوە، دونیامان جیاواز ... تێڕوانینمان جیاواز.... بیرو هۆشمان جیاوازبوو لە یەکتری.

لەیەکەم وانەوە سەرنجی هەموانم بەلای خۆمدا ڕاکێشا. هەم لەبەر ئەوەی بەبەراورد لەگەڵ هاوتەمەنەکانم بالام بەرزو زیاتر پێگەیشتبووم زۆریش جوان بووم دووەمینیش زوو دەستم بەخوێندنی وانەکان کرد بۆیە مامۆستاکانم لەیەکەم وانەوە منیان ناسی.

دەمزانی بۆ ڕزگاربوون لەو هەموو ئازارو دەردو بێ چارەییە پێویست بوو سەرکەوتووبم، لەبەر ئەوەش دەبوو زیاتر لەهاوڕێکانم هەوڵبدەم.

لەکاتێکدا هەموو خەریکی ژیانو پێکەوەنانی هاوڕێ بوون، من لەدونیای بێ ئومێدیو تاریکی خۆمدا بووم، هیچ بیانویەکم بۆ دڵخۆش بوون نەبوو، لەبەر قاچەکانم نەمدەتوانی بچمە دەرەوە، لەگروپی هاوڕێکانمدا بەشداریم نەدەکردو نەمدەتوانی بەو جۆرە کاتەکانم بەسەربەرم کە دڵم دەیەوێت سەرەڕای ئەمانەش دەمزانی سەرنجی زۆرێك لە قوتابیەکانم ڕادەکێشا بەتایبەت کوڕەکان.

لەناو هاوڕێکانمدا کەسێکی وای تیانەبوو لەبواری دینو خووڕەوشتدا نموونەیی بێت، بەواتایەکی تر مەنتیقی حەلاڵو حەرام تیایاندا جێگیر نەبوو لەبەر ئەوە لەباسی پەیوەندی نێوان کوڕو کچدا تا بڵێی چاونەترسو ئیسراحەت بوون، هەرچی منیش بووم لەم بابەتەدا بەتەواوی بێگانە بووم، کەم قوتابی تیابوو وەك من خۆپارێز بن لەم بابەتەدا.

هەمیشە ئەم قسانەیان پێ دەوتم:

-بۆچی تێکەڵمان نابیت؟ بۆ هەمیشە بەتەنیایت؟ نەکا حەزت لەهاوڕێیەتی ئێمە نەبێت!!

منیش بیانوم دەهێنایەوەو دەموت:

قاچەکانم ئازاریان هەیە، پێم خۆشە بەتەنیا بمێنمەوە.

## یەکەم سەرکەوتنم:

لەکۆتایی کۆرسی ساڵی یەکەم نزیك بووبووینەوە، مامۆستای تورکیمان لە قوتابخانە خەریکی بڵاوکردنەوەی گۆڤارێك بوو، بۆیە لەپۆلدا داوای لەئێمەش کرد کە چەند بابەتێکی بۆ بنووسین، منیش ئەو شەوە لە بەشی

ناوخۆیی لاپەڕەیەك دارشتنم سەبارەت بەدایكم نووسی، دیسان دارشتنێك بوو لەقووڵایی هەستو سۆزەرە نووسرابوو، دووبارە لەنێو فرمێسكدا نوسیبوومەوە.

مامۆستاكەم ئەوەندە دارشتنەكەمی بەدڵ بوو بەردەوام پیایدا هەڵدەدامو پێی وتم:

-گۆڤارێكی بەناوبانگ پێشبڕكێیەكی پەخشان نووسین بەرێوە دەبات با بۆ ئەوێش بنێرێت ئەگەر سەركەوتوبویت هەم خەڵات هەم بۆ قوتابیە سەركەوتووەكان پارەی قوتابخانە دابین دەكرێت.

منیش بەشداریم كرد بەڵام لەبەر ئەوەی پێشبڕكێكە لەسەر ئاستی توركیابوو زۆر هیوادار نەبووم.

لەدوای كۆتا پێداچوونەوە دووبارە بۆ مامۆستای توركیم خوێندەوە، وتی:

-زۆر نایابە! من دڵنیام سەركەوتوو دەبیت، نووسراوێك كە بەم چەشنە پڕ هەستو سۆزەوە نووسرابێت بەدڵنیاییەوە زۆر كاریان تێ دەكات، من باوەڕم وایە حەكەمەكان گرنگی بەپەخشانەكەت دەدەن.

هەواڵەكەم لەرۆژی وەرگرتنی كارتدا پێگەیشت، دوو دڵخۆشی لەیەك كاتدا.. مامۆستاكانم و، هاوڕێكانی قوتابخانەكەم بەگرنگییەكی زۆرەوە لێیان دەروانیم، لەو رۆژەوە بەدواوە هەمووان كچەكاڵە شەلەكەیان دەناسی جگە لەوەش نمرەی سەر كارتەكەم هەموو (٥) بوون، بۆ قوتابییەكی وەك من كە لە تەنهاییدا دەژیام سەركەوتنێكی زۆر گەورە بوو.

لەپێشبڕكێكەدا من یەكەم بوومو وەك خەڵات چەكێكیان پێدام ئەو پارەیە بۆ قوتابییەكی وەك من بڕێكی زۆر بوو و تا كۆتایی هاتنی قوتابخانەش پێداویستیو یارمەتی قوتابخانەیان گرتەئەستۆ.

خودا بەم شێوەیە کێشە مادییەکانمی ئەگەر چی بۆ ماوەیەکی کاتیش بێت چارەسەرکردبوو.

گۆڤارەکە ژیانی پڕئازارو ناڕەحەتیی منو ئەو سەرکەوتنانەی کە بەدەستم هێنابوون کردبوویە هەواڵێکی فراوان لەناکاو ناوبانگم دەرکرد. لەقوتابخانەدا ناوم بە "کچەکاڵەکە" دەرکرد ڕێک وەك ئەوەی مامۆستا سێڤگی پێی دەوتم.

ئەم سەرکەوتنە بچوکە تاڕادەیەك دڵخۆشییەکەمی زیاد کردو منی لە دونیای خەم هێنایە دەرەوە، لەبەر ئەوەی دارشەقەکانیشم فڕێ دابوو زۆر ئیسراحەت بووم، لەو ڕۆژەوە هاوڕێکانم منیان دەویست... بەڵام من لەو ڕۆژانەوە هەستم بە ترسێك کردبوو...

لەبەرئەوەشی جوانیەکەم سەرنجی هەموانی ڕاکێشابوو ڕووبەڕووی سەرنجی زۆر چڕی کوڕەکان دەبوومەوە، لە پۆلەکانی تریشەوە زۆر کوڕ دەهاتن دەیانویست ببمە هاوڕێیان، تەنانەت هەستم دەکرد هەندێك لە مامۆستا کوڕەکانیش جیاوازتر سەیرم دەکەنو هەوڵی نزیك بوونەوە دەدەن، هەموو ئەمانە پێیان دەوتم کە پێویستە زۆر وریابمو لەهەر ئانو ساتێکدا ئەگەری ئەوە هەبوو کە ڕووبەڕووی کێشەی گەورە ببمەوە. بۆ کچێکی بوکەڵەی وەك من کە هێشتا لە نیازو فێڵەکانی دونیا تێنەگەشتبوو، لەهەر مانگێکدا تەڵەیەك بۆم حازر بوو.

## یەکەم دیاریی ساڵی دووەم:

پشووی هاوینم لە ماڵی بەڕێوەبەری ناوەندیم بەسەر برد. ماڵی ئاوا بێت هاتو منی لەگەڵ خۆی برد، لەگەڵ خێزانەکەی منیان لە منداڵی خۆیان جیانەدەکردەوە، لەبەر ئەوەی کوڕو کچەکەیان چووبوونە ماڵی

خۆیان تەنیا منو بەڕێوەبەرو خێزانەکەی لەماڵدا مابووینەوەو، بەتەواوی وەك خێزانێکی ڕاستەقینە بەگەرمی مامەڵەیان لەگەڵدا دەکردم، من هەمیشە قەرزاری ئەو مرۆڤە چاکانەم.

لەدوای دەستپێکردنی دووەم ساڵی خوێندنم، ڕووبەڕووی دوومیوانی پڕ نهێنی بوومەوە کە بۆ بینینی من هاتبوون، چوومەخوارەوە بۆ هۆڵی میوانداری بینیم دوو کەسی تەمەن مامناوەند یەکێکیان پیاو ئەوی دی ئافرەت بوو لەیەکەم بینینەوە تێگەیشتم کە تورك نەبوون.

خۆمان بەیەك ناساند.

ناوم و ڕابردووم و ئەو ڕووداوانەی بەسەرمدا هاتبوون بەباشی لێی ئاگادار بوون، ئەمە لەحاڵەتێکدا ئەو زانیاریانەی ئەوان پێیان دام لەدایکم زیاتر ڕێی تێ نەدەچوو کەسێکی تر بیزانێت.

بەسەر سوڕماوییەکی زۆرەوە پرسیم: ئێوە من لەکوێ دەناسن؟

وتیان:

—ئێمە لەخۆبەخشانی مەسیحین، واتە ئەو کەسانەی کە خۆیان تەرخان کردووە بۆ بڵاوکردنەوەی دینی مەسیحی، دەشزانین تۆ مەسیحییت، ئێمە لەبەرخاتری تۆ لەشوێنێکی زۆر دوورەوە هاتووین دەمانەوێت یارمەتیت بدەینو لەم تەنیاییە ڕزگارت بکەین.

بەسەر سوڕماوییەوە پرسیم:

—دەتانەوێت چۆن یارمەتیم بدەنو چۆن لەم تەنیاییە ڕزگارم دەکەن؟!

—دەتبەین بۆ فەرەنسا یاخود ئیسرائیل، هەڵبژاردن لەدەستی خۆتدایەو بۆ کوێ بتەوێ دەتبەینە ئەوێ.

لەویّ پێداویستییەکانت بە باشترین شێوە بۆ دابین دەکەین، لەم ژیانە تەنیاو ناخۆشە ڕزگارت دەکەین، چونکە تۆ سەر بەوێیت، ئەم تورکانە دایكو باوکتیان هەڵخەڵەتاند، تۆ ئەمانەتێکی ئەوانیت لەلای ئێمە، ڕێگەنادەین تۆش وەك ئەوان هەڵبخەڵەتێنن.

ئەوەندە کەسانێکی خوێن ساردو جددی بوون، وەك ئەوەی هیچ شانسێکم نەبوو تا بڵێم: "نەخێر" لەهەر ڕستەیەکدا کە دەیانوت ئیشارەتی ئەوەیان دەدامێ کە ئەگەر من ئەم کارە قبوولٚ نەکەم ئەوان بەزۆر پێم دەکەن.

وتیان:

–دوو ڕۆژ ماوەت دەدەینێ تا بیر بکەیتەوەو دووبارە دەگەڕێینەوە، پاشانیش ڕۆیشتن.

## زۆر ترسام:

من چیتر موسوڵمان بووم، دایكو باوکیشم بە موسوڵمانی وەفاتیان کردبوو، هەرچەندە لەژیانێکی قورسیشدا بووم بەڵام ئێرە نیشتمانی من بوو، نەمدەتوانی جێی بهێڵمو بڕۆم. بشرۆشتمایە لەویّ دڵخۆش نەدەبووم، هەروەك چۆن دایکم بۆ یادگاریەکانی باوکم تەمەنی فیداکرد، منیش نەمدەتوانی دایكو باوکم جێ بهێڵم، چونکە هەرکات بێ تاقەت بووبوومایە بە خۆڵی سەرگۆڕەکانیان سوکناییم دەهات.

لەبەرامبەر ئەو ڕووداوەدا زۆر ترسابووم لەبەر ئەوە کێشەکەم لای کەس باس نەکرد، بڕیارمدا خۆم هەوڵی چارەسەری ئەم کێشە چاوەڕوان نەکراوە بدەم، چونکە زانینی بێگانەبوونی بنەچەم لەوانەیە ببوایەتە هۆی

کێشـەی گـەورەتر، ئـەو کەسـانەی کـە ئێسـتا منیـان قبووڵـەو تەنانـەت خۆشیشیان دەوێم ڕەنگە لەچاوتروکانێکدا من لەژیانی خۆیان دەربکەن.

دووبارە مێشکم ئاڵۆزبوویەوە، دووبارە قەسـابە دەسـت خوێناوییـەکان بیرو هۆشمیان خستبووە بـەر چـەقۆ، دووبـارە خـەریك بـوو هـەموو شـتێك تەواو دەبوو، دووبارە بەردەمم پڕبـوەوە لـە بەربەسـت... خوایـەگیان مـن ئێستا چی بکەم؟

ئەم مرۆڤە سەیرانە ئێمەیان چۆن دۆزیبووەوە؟ ئایا نیازی ڕاسـتەقینەی ئـەوان بریتـی بـوو لەدوورخسـتنەوەم لێـرەو، گێڕانـەوەم بـۆ سـەر دینـی مەسیحی! یاخود ئەمە پلانێك بـوو لەلایـەن بنەماڵـەی دایـكو باوکمـەوە! لەڕاستیدا مێشکم بەتەواوی تێکەڵ بووبوو.

لەدوای دووڕۆژ دووبـارە هاتنـەوە، زۆریـان کـرد تـا لەگـەڵیان بـڕۆم بـۆ شـیرینی خانەیـەك منـیش لەبەرئـەوەی وەزعەکـەم نەشـێوێنن لەگـەڵیان ڕۆیشتم.

ڕۆیشـتین... بـە بـەردەوامی ئـەو خانمـە باڵابـەرزە کـە کەسـایەتیەکی جەربەزەو زۆر ڕەقی هەبوو قسەی دەکرد، هەرچی پیاوەکەشە زۆر پیاوانە دیاربوو هیچ خۆی هەڵنەدەقورتاند.

کاتێك ئەندێشەکانی خۆمم سەبارەت بەوان خستەڕوو خانمەکە دەستی بەپێکەنین کردو وتی:

–نەخێر، تەنیا ئامانجی ئێمـە ڕزگـار کردنـی کچێکە کـە دایـكو بـاوکی مەسیحی بوونو ئەمڕۆش لەنێو تورکەکاندا ژیانێکی ژێر دەسـتە دەژی، لـە بنەماڵەی دایك و باوکیەوە هیچ داواکاریەکمان پێ نەگەیشتووە، بەڵام ئێمە ئەوان دەناسین هەرکات ویستت دەتـوانین بتبەینـە لایـانو بەیـەکتان شـاد بکەینەوە.

وتم:

—نەخێر.. من موسوڵمانم، دایكو باوكیشم بەموسوڵمانی كۆچی دواییان كردووە ئەوان لەم خاكەدا نوستوون، من ناتوانم ئەوان جێ بهێڵمو بۆ هیچ شوێنێكیش نایەم.

خانمەكە سەرنجە تیژەكانی وەك تیر بڕیە ناو چاوەو بە تۆنێكی بێ سازشەوە وشە وشە دەستی بەقسەكردن كرد:

—بڕوانە كچی جوان... هەستو سۆزەكانت واز لێ بێنەو ڕوو بەڕووی واقیع ببەرەوە، تۆ ئێستا زۆر تەنیایتو لەنێو ژیانێكی پڕ ئازاردایت هیچ ئومێدێكت سەبارەت بە داهاتووت نییە، لەوەش خراپتر لە هەرئانو ساتێكدا بۆی هەیە تووشی بەڵاو كارەساتی قورس ببیت، ئەوەندە غەریبو تەنیایت ڕەنگە نەتوانیت بەرەنگاریان ببیتەوە، لەتوانای پێكهێنانی داهاتووتدا نیت.

وەك خۆت ئاگاداریت توركەكان بەزۆر باوكتیان كرد بەموسوڵمان دایكیشت لەخۆشەویستی باوكتدا وازی لەدینەكەی خۆی هێناو ئەویش موسوڵمان بوو، بەدڵنیایەوە تۆش بەڕێی ئەودا دەڕۆیت، بەڵام تۆ زۆر منداڵ بویتو نەتدەزانی چی دەكەیت، بۆئەوەی بتوانین ژیانێكی نوێت بۆ پێكبهێنین سەرەتا پێویستە بگەڕێیتەوە سەر ئەسڵەكەت، لەبەر ئەوە پێویستە تۆ لێرە ڕزگاربكەین، دواتر دەتوانیت بگەڕێیتەوەو سەردانی دایكو باوكت بكەیت، تەنانەت دەتوانیت جەنازەكانیشیان لەگەڵ خۆت بەریت، لەم بابەتەدا هەموو جۆرە پشتگیرییەكت دەكەین، تەنها تۆ بەگوێمان بكە، باوەڕت پێمان هەبێتو كۆمەكیمان بكە ئەگەر نا...

سەری داخستو هەناسەیەكی قووڵی هەڵكێشا...

پێویست نەبوو هیچ بڵێت من زۆر باش تێگەیشتم.

مێشکم بەتەواوی جەنجاڵ بووبوو، بیرۆکەکان لەمێشکمدا هاتوو چۆیان دەکرد نەمدەزانی چی بڵێمو لەکوێوە دەست پێ بکەم.

بە یەکەم پرسیار کە هات بەمێشکمدا دەستم پێکرد:

کەواتە، مادام ئاگاتان لەهەموو شتێکە بۆچی کاتێک دایکو باوکم لەو حاڵە ناخۆشەدا بوون یارمەتیتان نەدان؟! بۆچی چاوتان لەئاست ئەو هەموو بەڵاو نقوم بوونو تاریک بوونی ژیانیاندا نوقاند؟

ئەمجارە پیاوەکە وەڵامی دایەوە:

–زۆر هەوڵماندا یارمەتیان بدەین، بەڵام هەم باوکت، هەم دایکیشت ڕەتیان کردەوە، چووبوونە نێو مێشکیانەوە، باوەڕیان پێ نەکردین.

## ئەوان باوکو دایکمیان کوشتبوو؟!

لەوکاتەدا فیکرێکی وەک هەورە بروسکە هات بەمێشکمدا، باوکو دایکیشم بەشێوەیەکی نەزانراو لەڕووداوێکی پڕ نهێنیدا گیانیان لەدەست دابوو، نەکا دایکو باوکم لەبەر وازهێنان لە دینەکەیان لەلایەن ئەم کەسانەوە سزادرابن؟!

ئەم بیرۆکەیە وەک تیرێک بەردڵم کەوت.

خانمەکە وەک ئەوەی هەستی بەم بیرۆکەیەی من کردبێ یەکسەر وەڵامێکی حازرکرد:

–بۆ پاراستنی دایکو باوکت هاوڕێیانمان زۆر هەوڵیاندا، بەڵام نەیانتوانی وایان لێ بکەن تاگوێ لەقسەبگرن، ئێمە دڵنیابووین ئەگەر ئەوان نەمردنایە دووبارە دەگەڕانەوە سەر دینی مەسیحی، ئەوان بەجوانی لەمەسیحێتی نەگەیشتبوون بۆیە موسوڵمان بوون.

تۆش ئەگەر مەسیحێتی بە باشی بناسی هەر ئێستا واز لەموسولمانی دەهێنیت، بەئازارێکەوە کەلەدلمدا جێگیربووبوو وتم:

–نەخێر... من پێویستم بەوە نییە، موسولمانێتی بۆ من بەسە، هەموو جۆرە پێداویستییە ڕۆحییەکانم دەست دەکەوێت، من پێویستم بەدینێکی تر نییە.

–بەلام پێویستە گوێمان لێ بگریت، چی ڕوودەدات بەگوێگرتن؟ ئێمە نالێین هەر ئێستا ببە بە مەسیحی، گوێ لەئێمەش بگرەو خۆت بڕیاربدە.

دەستیان کرد بە باسکردنی مەسیحیەت، هەموو باشیو جوانیو حەقو دادوەرییان وەك مەسیحیەت باسکرد، ئەوەندە مەوزوعی سەرنج ڕاکێشیان باسکرد بەشێوەیەك دەدوان ڕێك بەو جۆرەی لەگەلّ مەزاجی مندا دەگونجا.

چەند سەعاتێك گوێم لێ گرتن، هەروەها ئینجیلێکیشیان بەدیاری پێدام، ویستیشیان بڕێك پارەم پێ بدەن بەلام نەمویست.

وتیان:

–تۆ بیر لەقسەکانمان بکەرەوە، لەماوەیەکی کەمیشدا بڕیاری خۆت بدە، هەرکات ئامادەبوویت دەتبەین بۆ ئەو شوێنەی کە تۆ دەتەوێت یاخود بۆلای خزمەکانت.

بەبەلێنی دووبارە یەکتربینینەوە جیا بووینەوە.

لەمێشکمدا هەزارەها خەیالّ دەیان خوێند، بەجۆرێك دەنگیان دەدایەوە کە خەریك بوو گوێچکەم دەتەقی، سەرم سوڕمابوو، بێزاربووبووم و دەترسام... ئەو شتانەی کە ئەوان باسیان دەکرد لەسەرەتاوە شتانێکی زۆر جوان بوون بەتایبەت بۆ ڕزگاربوونم لەم تەنیاییەو شادبونەوەشم بە بنەمالّەکەم و وەرگرتنی خوێندنێکی باشو

شادبوونم بەژیانێکی خۆش لەڕاستیدا دڵم بۆی لێی دەدا، بەڵام من چیتر موسوڵمان بووم، چۆن دەمتوانی دایكو باوکم جێبهێڵم بەتایبەتیش چۆن دەمتوانی ببمە مەسیحی؟! ئەم دوو فیکرە لەمێشکمدا بەرهەڵستییان دەکرد.

هەر بەڕاستی مەسیحییەت ڕاستو موسوڵمانێتی هەڵەبوو؟ تۆ بڵێی ئێمە لەبەر ئەوەی ڕاستەقینەی مەسیحییەتمان نەدەزانی بۆیە تا ئەمڕۆ موسوڵمان بووین! ئەگەر موسوڵمانێتی ڕاستەقینەیە بۆچی وڵاتە ئیسلامیەکان دواکەوتوونو وڵاتە مەسیحییەکان پێشکەوتوون؟ لەمێشکمدا پرسیاری زۆرتر بەجێ مابوون لەو مەوزوعانەی کە باسیان کردبوو.

ڕاستو هەڵەکان، باشو خراپەکان بەسەریەکدا تێکەڵ بووبوون، من وام لێ هاتبوو کە نەمدەزانی چی بکەم!

## مامۆستاکەم بەهانامەوە هات:

کاتێك هاتمەوە بۆ قوتابخانە لەحاڵێکی پەرێشاندا بووم، کاتێك مامۆستای تورکیم منی بینی وتی:

–شتێك ڕووی داوە کچی خۆم؟

وتم:

–نەخێر... من باشم.

هەوڵمدا بیشارمەوە بەڵام مامۆستاکەم لەبەر ئەوەی چاودێرێکی باشبوو هەڵی دایەو وتی:

–نا، نەخێر... تۆ شتێکتە باسی بکە تابزانم چی بووە؟

ئەمە قورساییەك نەبوو كە بتوانم بەتەنیا هەڵی بگرم... پێویستم بەهاریكارییەكی زۆر گەورە هەبوو، ئەو كەسەش دەكرا مامۆستای توركیم بێت، كەسێكی پاكو ڕاستگۆو دیندار بوو.

—لەگەڵ خۆبەخشە مەسیحیەكاندا قسەم كرد... بەزۆر توانیم كۆنترۆڵی خۆم بكەم، مێشكم ئاڵۆز بووە.

ئەندێشەكانی مامۆستای توركیم لەناكاو لەدەمو چاویدا ڕەنگی دایەوەو بەدەنگێكی خەفەتاوی و پڕ قینەوە وتی:

—تۆ ئەوانە ناناسیت كچم، ئەوان بەشێوەیەكی بێتاوان نزیك دەبنەوە بەڵام نیەتیان زیاتر هەڵخەڵەتاندنی قوتابیە زیرەكەكانەو ڕاكێشانیانە بەلای خۆیاندا.

بەپاڕانەوە داوام لەمامۆستا كرد پرسیم:

—مامۆستا ئەمانە كێن، دەمەوێت بیان ناسم، ئاسوودەم بكە تكایە.

منی بردە ژووری مامۆستاكان، سەرەتا چایەكی پێدامو دواتر دەستی بەقسەكردن كرد:

—گوێ بگرە جانان كچەكەم، بەهەموو جۆرێكی پڕوپاگەندەكردن بۆ مەسیحیەت لە ژێر ناوی چەندەها چالاكی جۆراو جۆرداو لەو وڵاتانەی كە مەسیحییەت تیایاندا بەرقەرار نییە دەوترێت "خۆبەخشین بۆ بڵاوكردنەوەی دین" و بەو دامەزراوانەی كە دروستكراون بۆ بڵاوكردنەوەی ئەم دینە لە كەنیسەكانو ئەو وڵاتانەی كە مەسیحییەتیان تیابڵاو نییە پێیان دەوترێت "دامەزراوەی خۆبەخشین (مژدەبەخش)" و بەو كەسانەی كە بەڕێوەبەرایەتی دەكەنو چالاكییەكان پەخش دەكەن دەوترێت "خۆبەخش".

## ڕووی ڕاستەقینەی خۆبەخشەکان!

سەرەتا ئەو شوێنانەی خۆبەخشەکان بۆ کارکردن دەستیان بەسەردا گرتووە بریتییە لە قوتابخانەکان، کۆرسەکانی فێربوونی زمانە بیانیەکان، نەخۆشخانەکان، خانەکانی تەندروستی، خانەکانی بێ باوکان، ناوەندەکانی پەخش و بڵاوکردنەوەو، دامەزراوە خێرخوازییەکان.

خۆبەخشەکان خاوەنی کۆمەڵێ تواناو تایبەتمەندیین، دەتوانن بەگوێرەی ئەو وڵاتو کۆمەڵگانەی کە چالاکیەکانیان تیادا دەکەن شێوازی خۆیان بگۆڕن. هەروەك چۆن دەتوانن وەك باندی سواڵکەرەکان خۆیان ڕێك بخەن لە وڵاتە داگیرکراوەکاندا بەشێوەی باند دەبینرێن بەحساب بۆ پارێزگاری کردنی خەڵکەکەی هاتوون، لەلایەکی تریشەوە خۆبەخشەکان بەوە ناسراون کە بەردەوام لەسەفەردان و لەتواناناندایە شوێنێکی دیاریکراو وەك دەوڵەتێکی بچوکی لێ بکەن، لەگەڵ ئەمانەشدا زۆرجار چوونەتە نێو دەوڵەتە موسوڵمانەکانەوەو تێکەڵ بەچەند تەریقەتێك بوون و خۆیان وانیشانداوە کە لەو تەریقەتەدا کاردەکەن.

خۆبەخشەکان، بۆ گەیشتنە ناو دەوڵەتی عوسمانی کە لەخاڵی گرنگی جوگرافیای دونیادا بوو، وزەیەکی زۆریان سەرفکرد بۆ مانەوەو هێنانەدی ئامانجەکانیان، سەرەڕای ئەمانەش بەهانەی ئەوە دەهێننەوە کە دەیانەوێت گەورەترین وڵاتانی جیهان بناسن، کۆمەڵگەکانی ڕۆژهەلات ببینن و سەردانی ئەو شوێنانە بکەن کە مەسیحییەتی تیادا پیرۆز ڕادەگیرێت.

هەروەها بەبیانوی یارمەتیدانی مەسیحیەکانی ژێر دەسەڵاتی عوسمانی داواکارییان پێشکەش دەکرد.

–باشه مامۆستا، ئەم خۆبەخشانە بۆچی تورکیای سەر بەدەوڵەتی عوسمانییان هەڵبژاردووە؟

–ئەمە ڕوون و ئاشکرایە، چونکە خۆبەخشین لەسەر خاکی عوسمانیەکان دڵی هەر تاکێکی مەسیحی بەلای خۆیدا ڕاکێشابوو، ئەمەش بەهۆی دوو هۆکارەوەبوو:

یەکەم: دەوڵەتی عوسمانی بەرامبەر بیانیەکان لەڕادەبەدەر سنگ فراوان و دادپەروەر بووە، چونکە خۆبەخشەکان ئەوەندەی لەژێر سایەی دەوڵەتی عوسمانیدا ئیسراحەت بوون، لەزۆرێك لەولاتە مەسیحییەکاندا ئەم ئیسراحەتەیان بەدەست نەکەوتووە، ئەوان لە ئیمپراتۆریەتی عوسمانیدا توانای ئەوەیان هەبوو هەموو جۆرە چالاکیەك ئەنجام بدەن.

دووەمیش: ئەو شوێنانەی کە دەوڵەتی عوسمانی بەڕێوەیان دەبرد بەشێکی گرنگی پێك هاتبوو لەشوێنە پیرۆزەکان، هەروەها ئەو شوێنانەی دەوڵەتی تورکیای لەسەر دامەزرابوو لەڕووی جوگرافیای ڕامیارییەوە یەکێك بوو لە ناوچە جوگرافیە گرنگەکان. دامەزراندنی دەوڵەتی عوسمانی لەسەر خاکێکی دەوڵەمەند بە کانزاکان و بوونی بەکورتە ڕێگایەك بۆ گەیشتن بەڕۆژهەلات کە بریتی بوو لە دووخاڵی گرنگ لە دەریای ناوەڕاستەوە بۆ دەریای سوور لەدەریای ناوەڕاستەوە بۆ بەسرە. ئەمانە سەرنجی زیاتری ئەوانی بەلای خۆیدا ڕاکێشابوو.

هەمان یاری لەم سەردەمەشدا بەردەوامە. بەتایبەتیش لەناوچەکانی ئیجەو دەریای ڕەش خۆبەخشەکان چالاکیە چڕوپڕەکانیان بەرچاو دەکەوێت، تەنانەت هەوڵ و تەقەلایەکی تایبەتیان داوە بۆ پارچە پارچە کردنی ولات بەیارمەتی دانی ئەو کۆمەڵ و گروپانەی کە بونیادی نەژادییان

هەیە هەموو ئەم هەولانە زیاتر لەوەی مەبەست لێیان ناساندنی حەزرەتی عیسا بێت مەبەست لێیان ئامانجی سیاسیو ئابوورییە.

–دینی مەسیحی لەپێشتردا هاتووەو دینی ئیسلامیش دواتر، چۆن دەزانین کە دینی ئیسلام بەرزترو پەسەندترە؟!... بۆچی موسوڵمانێتی لەمەسیحییەت بەرزترە؟!

## وەڵامی زۆرنایاب لە (پەیامەکانی نوور)ەوە:

مامۆستای تورکیم جانتاکەی دەستی کردەوە کتێبێکی گەورەی دەرهێنا.

– پرسیاری کرد کە ئایا ئەم کتێبەم لەشوێنێکی تر بینیوە؟

وتم:

– نەخێر ئەمە یەکەم جارمە دەیبینم.

–مەکتوبات... ئەمە تەفسیری قورئانی بەدیعوززەمان مامۆستا سەعیدی نوورسییە، دەمەوێت وەڵامی ئەو پرسیارەی کە لێت کردم لەم کتێبەدا بۆت بخوێنمەوە.

سەیرکە تۆ ئینجیلێکت پێیە، من لەم مەکتوباتەدا بەشێکی کە بریتییە لەبەشی (نۆزدەیەم) دەخوێنمەوە تۆش بەراوردی بکە بە ئینجیلەکە.

دەبینی کە لەئینجیلدا هەواڵی ئیسلامو پێغەمبەرمان محمدﷺ هاتووە.

بۆ نموونە لە ئینجیلی یوحەننادا بابی (١٤)ەو ئایەتی (٢٠)ەم بکەرەوە.

لەئینجیلەکەی دەستمدا ئەو شوێنەم دۆزییەوە کە مامۆستاکەم پێی وتم، ئەو لەکتێبەکەی دەستیدا دەستی بەخوێندنەوە کردو منیش لە ئینجیلەکەدا بەراوردم دەکرد.

*"چیتر لەگەڵ ئێوە زۆر ناڵێم: چونکە سەرۆکی گشت گەلان لەڕێیە هەروەها لەمندا هیچ کات ئەو تەواوکارییەی ئەو نیە"

–بەڵێ مامۆستا ئەوەی خوێندتەوە بەتەواوی لەئینجیلیشدا هەیە.

نموونەیەکی تر:

–لەئینجیلی یوحەننا بابی (١٦)ەو ئایەتی (٧)

*"من ڕاستیتان پێ دەڵێم ڕۆشتنی من بۆ ئێوە سودی هەیە، چونکە ئەگەر من نەڕۆم ئەوا دڵنیایی بۆ ئێوە نایەتەکایەوە".

چاودێریم دەکرد وشە بەوشەی وەك یەك بوو...

مامۆستاکەم بەردەوام بوو لەخوێندنەوە.

–ئینجیلی یوحەننا بابی (١٦) ئایەتی (٨)

*"کاتێك حەزرەتی محمدﷺ دێت، کێشەکانی ژیان سەبارەت بەگوناه و باشەو حوکم ڕێك دەخات"

بابی (١٦)ئایەتی (١١)

"چونکە سەردەمی حوکمی سەرکردەی گشت گەلان هاتووە"

بابی(١٢) ئایەتی (١٣)

"بەڵام کاتێك زاتی حەق دێت، ئێوە بەرەو حەقیقەت ئاڕاستە دەکات. چونکە ئەو لەخۆیەوە قسەناکات بەڵکو ئەوەی دەبیستێ دەیڵێتو لەبارەی داهاتوەوە هەواڵتان پێ دەدات"

ئەوانەی خوێندیەوە ڕاست بوو لەئینجیلدا هەبوو، بەڕاستی سەرنج ڕاکێش بوون. کەواتە ئینجیلی مەسیحیەکان موژدەی هاتنی پێغەمبەری ئێمەی داوە. ئەمە سەلماندنێکی زۆر نایاب بوو.

ئەگەر ئەمە وتەی کتێبەکەی خۆیانە بۆچی بەرگری لە بالادەستبوونی مەسیحێتی دەکەن بەسەر موسوڵمانێتی دا مانای وایە ئامانجی ئەم خۆبەخشانە پڕوپاگەندەی سیاسی بوو.

مامۆستاکەم بەردەوام بوو لەڕوون کردنەوە:

–ئێمە باوەڕمان وایە کە حەزرەتی عیسا (علیه سلام) لە خاچ نەدراوەو نەکوژراوە، بەڵکو لەجێی ئەو کەسێکی دیکە کوژرا (کە خیانەتی لێ کردبوو) کە خوای گەورە ڕەنگی عیسای دا بەسەریداو بەویان زانی و کوشتیان. حەزرەتی عیساش خوای گەورە پایەی بەرزی دایەو، بەرزی کردەوە بۆ ئەو شوێن و پایەی خۆی بۆی دیاریکردووە.

–چۆن یەعنی؟ ئێستا حەزرەتی عیسا لەژیاندایە؟

بەڵێ، بێگومان.

–"پلەکانی ژیان پێنج دانەن، ئەو لەپلەی سێیەمی ژیاندایە:

یەکەم پلە: ئەم ژیانەی ئێمەیە کە پابەندی چەندین هەلومەرجی تایبەتییە. دووەم پلە: ژیانی حەزرەتی خزرو ئیلیاسە. سێیەم پلە: ژیانی حەزرەتی عیساو ئیدریسە کە لە ژیانی ئێمە جیاوازن و وەکو فریشتە دەژین....[1]

حەزرەتی عیسا تەمەنی ٣٣ ساڵی تەواو کردوە ئێستا لەڕەهەندی ژیانێکی نورانی دایە، پێغەمبەرمانﷺ موژدەی دووبارە دابەزینەوەی ئەوی بۆ سەر زەوی لەڕۆژی دوایدا داوە هەروەها ئەوەشی ئیفادەکردووە کە حەزرەتی عیسا ڕۆڵێکی گرنگ دەبینێت لە تێکشکاندنی بیری ئەوانەی

---

١– کتێبی (مەکتوبات)ی مامۆستا سەعیدی نورسی، وەرگێڕانی فاروق ڕەسول یەحیا، لاپەڕە(٥–٧).

نکۆڵی دەکەن، ئێمە باوەڕمان وایە حەزرەتی عیسا دەگەڕێتەوەو لە ڕۆژئاواوە بەرەو ڕۆژهەڵاتو بەو هەناسەی ژیان بەخشەیە، فووی پیادەکاتو وڵاتە کۆمۆنیستەکانی کە شانۆکاری بیرۆکەی نکۆڵی کردنن وەك پارچەکانی دۆمینە لەگەڵ زەوی تەختیان دەکات.

## خۆبەخشەکانم دەرکرد:

خودا هەزارجار لێی ڕازی بێت، دانیشتنم لەوێ لەگەڵ مامۆستای تورکیمو پێدانی ئەو وەڵامە موقنیعانە منی لەڕووداوی زۆر ترسناك ڕزگارکرد.

کاتێك دووبارە لەگەڵ خۆبەخشەکاندا کۆبوینەوە ئەوانم بەگوتارێکی دڵنیاییەوە ڕەت کردەوە. وتم:

—بەهیچ جۆرێك جارێکی تر بێزارم مەکەن، من موسوڵمانم، تا تەمەنیشم کۆتایی دێت هەر بەوشێوەیە دەمێنمەوە، ئەم خاکە نیشتمانی منە، هیچ هێزێك ناتوانێت لەم خاکەو لەدایكو باوکم جودام بکاتەوە.

زۆریان هەوڵداو لەژێرەوە دەیان هێناو دەیانبردو بەڵام هەرلەوێدا ئەو بابەتەم لەگەڵیان بڕاندەوە، تەنانەت ماوەیەك دەستیان بەهەڕەشەکردنیش کرد بەڵام وەڵامی من بەم جۆرەبوو.

—ئێوە دەتوانن تەنها بەرەو مردنم بەرن بەڵام ئەوکاتە ئێوەش لەژیاندا نامێنن چونکە لەم نیشتمانەدا قارەمان زۆرە کە بتوانێت ژیانی کچێکی موسوڵمان بپارێزێت.

دوای ئەوەی زانیان من سوورم لەسەر بڕیاری خۆم وازیان هێنا، بەڵام کارتێکیشان پێدامو وتیان:

—هەرکاتێك بیرورات گۆڕی پەیوەندیمان پێوەبکە.

کارتەکەم دڕاندو فڕێم دایەوە بەسەرو چاویاندا، ئەمە کۆتایی ئەو پەیوەندییە بوو یاخود ڕەنگە من پێم وابوو بێت کە ئەوە کۆتاییە! چونکە لەهەندێك لەو ڕووداوانەی کەبەسەرمدا دەهاتن هەستم بەدەستی نهێنی ئەوان دەکرد لە کارەکەدا، بێگومان ئەمە تەنها گومانێکیش بوو.

## دەستم لەخۆم بەردابوو:

گەیشتبوومە پۆلی چوارەمی ئامادەیی، جگە لە دوو مامۆستا کە یارمەتیان دەدام و چەند هاوڕێیەکیش کەسی ترم نەبوو، قوتابخانە بەگشتی ئەو قوتابیانەی لێ بوو کەڕۆژەکانیان لەدونیای خۆیاندا بەسەر دەبرد، بەڵام وەك کچێکی گەنج جاریەجاریش دەچوومە دونیای ئەوانەوە چونکە کەسێکی نزیکم نەبوو کە لەکاتی خۆیدا ڕێ نیشاندەرم بێت و ئاگادارم بکاتەوە.

ئەوەی کە بەردەوام بەرەو ئەو هەڵانەشی دەبردم جوانیەکەم بوو وادیاربوو لەدەوروبەردا بە کچێکی جوان ناسرابووم، جوانیەکەم بۆم بووبوو بە بەڵا، چەندین کەسانی نیەت جیاواز بەئەسپایی بەدەورمدا دەسوڕانەوە تەنانەت نەمدەزانی چۆن مامەڵەشیان لەگەڵدا بکەم، دەبێ کچێکی بێ ئەزموون لەناو شەپۆلە بێ ئەمانەکانی دونیادا چۆن ڕۆژەکانی ژیانی بگوزەرێنێت.

ئەمە تاقیکردنەوەیەکی زۆر قورس بوو، کام کچی گەنج نایەوێت لە دونیای ڕەنگاڵەییدا بگەڕێت و گوێی لەقسەی شیرین بێت و پیاهەڵدانی خۆش ببیستێت، دەی هەر ئەمانە بوون کەناخی منیان دەجوڵاند.

لەسەرەتادا سەرەڕای دوو مامۆستام لەژمارەیەکی زۆر لە کوڕە دەوڵەمەندەکانی قوتابخانەوە تەکلیفی زەواجم لێ کرا چیتر نەمدەتوانی

خۆڕاگریم بەتایبەت کاتێك ڕۆژانی شەممان و یەك شەممان دەعوەتیان دەکردم بۆ چوونە دەرەوە بۆ نان خواردن و ڕابواردن، بانگهێشتەکان ئەوەندە زۆر بوو کە لەوە زیاتر نەمدەتوانی خۆم ڕاگرم و لەبەرئەوەش زۆر جار لەگەڵیان دەچوومە دەرەوە.

بەدڵنیاییەوە لەسەرەتادا ئەمانە زۆر بەپاکی و بەریئانە دەستی پێکرد، بەگرووپی کوڕوکچ تێکەڵ دەردەچوون و دواتر بەتەنیا و قسەی تایبەتی...

هەر لەم ناوەندەشدا فێری جگەرەکێشان بووم، منێك کەلەپێشدا تەنانەت کۆلاشم نەدەخواردەوە بەڵام ئێستا چیتر زۆر بەئاسانی قومم لەبیرەش دەدا...

خراپترین لایەنی ئەمەش بریتی بوو لەوەی ئەو (یاسین)انەی کەبۆ ڕۆحی دایکم و باوکم هەموو شەوێك دەمخوێند، وردە وردە کەم بویەوە ئەو نوێژانەشی کەجارجار دەم کرد کەم کەم لەبیرم چویەوە، بەواتای کەلیمە دەستم لەخۆم بەردابوو.

من سیمبولی بێ کەسی و تەنیایی بووم، ئەم حاڵەی من بەرەو قۆناغێکی ترسناکتر هەنگاوی دەنا، هەندێك جاریش دەمبینی کە حاڵەتەکە زۆر جدییە لەخۆم تووڕەدەبووم و دەمزانی ئەو هەڵانە بەرەو بەڵاو موسیبەت پەلکێشم دەکەن، هەندێك جاریش وازم لەدنیا دەهێنا و هیچ شتێکم بەخەیاڵدا نەدەهات.

## ئاگارکردنەوەم لەلایەن مامۆستاوە:

لەو ڕۆژانەدا کە کچەکاڵەکە لەسەرزمانی هەمووان بوو، ئەو ئاگارکردنەوەی مامۆستای تورکیم هیچ لەیاد ناچێت.

-کچی خۆم حاڵی تۆ منی زۆر پەرێشان کردووە، لەبیرت نەچێت دۆستی ڕاستەقینە لەڕۆژانی تەنگانەدا دەردەکەوێت، ئەو دۆستانەی تۆ ئەمڕۆ دەیانبینیت هەموو ساختەن، ئیتر چاوەکانت بکەرەوەو ببینە ئەوانە فرسەتچیو نیەت ناپاکنو دەیانەوێت داهاتووت تاریك بکەن.

دەتوانرێت هەموو هەڵەیەکی مرۆڤ ڕاست بکرێتەوە بەڵام تەنها لەدەستدانێك کە ناتوانرێت قەرەبوو بکرێتەوە مردنە بەبێ باوەڕیو ڕووخانی کەسایەتیو ناموسە، هیچ شتێك ناتوانێت جێی ئەمانە بگرێتەوە، وریابە نۆرەی تۆ نەیەت!!

دووبارە لەبیر نەکەیت کە "خەڵکانی باش و چاکەخواز بەزەییان بەکەسێکدا نایەتەوە کە بەڕەزامەندی خۆی تووشی زەرەربووبێت".

ئەمڕۆ ئەو کەسانەی کە بەزەییان بەتۆدا دێتەوە لەبەر ئەوەیە کە بێ کەس و مەغدوریت، بەڵام ئەگەر لەم ڕێگە خراپانەدا نقوم ببیت ئەم مرۆڤانە چیتر دەستت ناگرنو هاوکاریت ناکەن.

دیسان لەیادت نەچێت کە خودا هەندێك تایبەتمەندی بەمرۆڤەکان دەدات بۆ تاقی کردنەوە، نەك بۆ تێرکردنی نەفسو ئارەزووە خراپەکانیان.

لەکۆتایشدا ئەوەت لەبیربێت ئەوانەی ئەمڕۆ لە دەورت دەسوڕێنەوە سبەی کاتێك زۆر شتت لەدەستدا چیتر لەدەرگات نادەن.

زۆرباش بیرلەمانە بکەرەوە! تۆ کچێکی ئاسایی نیت، تۆ ناچاریت سەرکەوتوو بیتو لەسەر پێی خۆت ڕاوەستیت.

مامۆستاکەم زۆر ڕاستی دەوت، گەورەترین دۆستی من، گەورەترین هێزو پشت و پەنام سەرکەوتن بوو. ئەم کارە پیسانەش تەڵەبوون بۆ ڕێگرتن لەسەرکەوتنم.

تاڕادەیەك هۆشم بەبەردا هاتەوەو هەوڵمدا خۆم كۆبكەمەوە، بەڵام وازیان لێ نەهێنام، ئەوەندە پیاهەڵدانی بێزاركەرو تەكلیف و پەیمانی دڵخۆشكەر هەبوون كەڕزگاربوون لێیان مومكین نەبوو.

لە كۆتاییدا قوتابخانەم تەواوكرد.

لە تاقیكردنەوەی زانكۆشدا سەركەوتووبووم، بەشی (ڕابەری پۆل)م لەكۆلێژی پەروەردە بەدەستهێنا، ئەمە خەونی من بوو، دەمویست ببمە مامۆستاو ڕێگەی ڕاست نیشانی قوتابیەكانم بدەم، بەتایبەتیش ئەو منداڵە پاكو بێ تاوانو جوانانەی كە وێڵ و لانەواز بوون و پەناگەیەكیان نەبوو.

دەمویست هاوكارییان بكەم و خەم و حەسرەتەكانیان بڕەوێنمەوە.

خوای گەورەش خۆزگەكەی هێنامەدی.

# بەشی هەشتەم

## زانکۆم بەدەست هێنا،
## بەڵام شۆکی ژیانم لێرەدا بەسەرمدا هات

**پوختەی ئەم بەشە**

ئامانجم ئەوەبوو کە ببم بە مامۆستای ئەو منداڵە پاك و بێ گوناهانە، وەکو خوشکی گەورەیان وەکو دایك بم بۆیان. سەرەنجام، لەبەرئەمە کۆلێژم بەدەست هێنا. بەڵام لەو شۆکە گەورەیەی ژیانم و لەدەستی ساردی مەرگ کە پێم دەگات بێ ئاگا بووم.

# بێ هەواڵ بووم لەو ڕووداوانەی کە بەسەرمدا دێن

کارەکانی زانکۆم تەواوکرد و لەبەشی ناوخۆیی زانکۆ نیشتەجێ بووم، هەموو شتێك زۆر جوان بوو، بەڵام بێ هەواڵ بووم لەو ڕووداوانەی کە بەسەرمدا دێن، خەونی پەمەییم دەبینی...

هێشتا ساڵی یەکەم بوو هەمووان منیان دەناسی، دووبارە هەمان سەرکێشی، لە ناخمدا هەبوو

کەمێکیش لەم ئیشەدا لاوێتی ڕۆڵی هەبوو، ئەوان سەریان خسبووە سەرم بەڵام لەڕاستیدا منیش پێم خۆشبوو کە منیان بەدڵە.

ساڵی یەکەم پارێزگاریم لەخۆم کرد، هەندێك لەتەڵەکانم بینی، بەپێی تێپەڕبوونی کات هەندێك کەسی نیەت خراپیشم لەکاتی خۆیدا کەشف کرد، بەڵام ئەم کێشمەکێشە تا کەی دەکرا بەردەوام بێت نەمدەزانی تاچەند دەتوانم بەرگە بگرم.

ساڵی دووەم فریودەرەکانی دەوروبەرم تادەهات زیادیان دەکرد بەتایبەتیش هەندێك لەکوڕە دەوڵەمەندەکان وازیان لێ نەدەهێنام.

منیش وردە وردە هەستم بەرامبەر بەیەکێك لەوانە جوڵا، لەیەکەم بینینەوە وادیاربوو نیەتی پاك بێت، گۆرانی خۆشەویستی بۆ دەوتم، بەجوانیەکەمدا هەڵی دەداو بەجوانترین کچی دونیا وەسفی دەکردم.

هەرچەندە خێزانەکەشیم نەدیبوو، بەڵام ئەو بەردەوام باسی دەوڵەمەندی خۆیانی دەکرد، سەیارە کەشخەکەی ژێریشی شایەتی بۆ دەدا.

کچێکی هاورێم کە لەهەمان پۆلدا بووین چەند جارێك ئاگاداری کردمەوە.

—نەکەی باوەڕ بەو کوڕە بکەیت... نیەتی ئەو پێکهێنانی هاوسەرگیری لەگەڵ تۆ نییە، چونکە یەکەم کچی ژیانی ئەو تۆ نیت.

باوەڕم پێ نەکرد بەپێکەنینەوە بەڕێم کردو لەدڵی خۆمدا وام هەست دەکرد ئێرەییم پێ دەبات.

## بووم بە داوەکەوە:

ئەو لەماڵێکدا بەتەنها دەمایەوە، ئێوارەیەك دەعوەتی کردم بۆ (چی کۆفتە)[1] خواردن. وتی پێکەوە بەتەنها خواردنێك دەخۆین و زۆری لێکردم، منیش قبوڵم کرد، ئەوە هەڵەترین کاربوو کە لەژیانمدا کردم.

ئێوارە چوومە ماڵیان، ماڵەکە دەبریسکایەوە هیچ لەماڵی کەسێکی تەنیا نەدەچوو ئەوەندە شتی کەشخەو نایابی لێ بوو یەکێك بیبینیایە وای دەزانی ئەمە ماڵی خێزانێکی زۆر دەوڵەمەندە، لەڕاستیدا زۆر سەرم سوڕمابوو، وتم:

—ئەمە ماڵی کەسێکی تەنهایە؟

—ئێمە لەو هەرزەکارە بێ پارەو پولانە نین کە بێ کار دەسوڕێنەوە، باوکم هات پڕ کەلوپەلی کردو ڕۆیشت، ئەمانە بەلای تۆوە کەشخەن

---

١- خواردنێکی تورکییە.

لەڕاستیدا شتێکی وانیە کە شایەنی باسکردن بێت، کەوابوو تۆ ئەگەر ڤێلاکەمان ببینیت لەسەرسوڕماندا زمانە بچکۆلەت قوت دەدەیت.

باوەڕم پێکرد...

ئای لەو خۆش باوەڕی و نەفامیەی من، باوەڕم بەهەموو کەس‌و بەهەموو قسەیەك دەکرد. ڕەنگیشە ئەمە هەستێك بێت لەمنداڵییەوە تیام مابێتەوە لەبەرئەوەی هەمیشە وا گەورەبووم کە پێویستم بەکەسانی دیکەبوو هەروەها لەبەر ئەوەی مافی هەڵبژاردنم نەبوو هەرکەس هەرچی بوتایە یەکسەر باوەڕم دەکرد.

زۆرجار نەمتوانیوە، بڵێم: نەخێر... قبوڵی ناکەم و، لەسەر ڕەتکردنەوەکەم سووربیم، ڕەنگە ئەمەش لەبەرئەوەبێت کە من نیەتی خراپ و ڕاستەقینەی ئەو خراپەکارانەی کە منیان بەرەو کەناری نەهامەتی برد نەدەزانی.

چووینە هۆڵەکەوە، هۆڵەکە ئەوەندە جوان بوو کە چاو پێی سەرسام دەبوو تا ئێستا شوێنێکی لەو جۆرەم نەدی بوو.

ڕاخەرەکان، قەنەفەکان، پەردەکان، مێزەکان‌و ئامرازەکانی ڕازاندنەوەی هۆڵەکە هەروەك خەونەکان کەشێکی پڕ نهێنیان خوڵقاندبوو.

لەتەنیشت (چی کۆفتە) کەدا، نا.. نەخێر.. لەناوەڕاستدا چەند مۆمێکی ڕەنگاو ڕەنگ.. بێگومان شوشەی عارەقیش...

هەموو ئەمانە بەڕوونی نیشانی دەدا کە من لەکوێوە بەکوێ گەیشتووم، ئەو ڕووداوە زۆر پڕ ئازاربوو، بەڵام بەداخەوە ڕاستەقینەبوو.

لەلایەکەوە بێ ساحێبی و، نەفامی و، لەلایەکی دیکەشەوە جوانییەکەم منیان بەرەو ئەو شوێنە بردبوو.

## گەورەترین شۆكی ژیانم:

لەسەر مێزەكە تەنیا ئێمە بوون... دووبارە هەمان قسەخۆشەكانو دووبارە هەمان پیاهەڵدانەكان.

"جوانترین كچی دونیا منم، جگە لەمن هیچ پەرییەكی جوانتر بوونی نییە، جوانیەكەم عەقڵی مرۆڤ سەراسیمە دەكات".

جوانترین هۆنراوە، جوانترین وتەی عاشقانە هەموو لەبەر من...

قابیلە من چیم! هەر بەڕاست لەبەر ئەوەی من بەڕاستی بەو شێوەیەم! بێگومان نەخێر... ئەمە جگە لەداوێك بۆ خوادرنی مەڕێكی بێ تاوان لەلایەن گورگێكەوە زیاتر هیچی تر نەبوو.

عەرەقەكە وردە وردە دەستی بەكاریگەری كرد لەسەرم، هەستم كرد خەریك بوو لەسەر خۆم دەچووم، واتە كەمێكی مابوو بۆ كارەساتو شۆكی ژیانم.

لەو كاتەدا خودا بەفریام گەیشت، لەناكاو دەنگی دەمانچەو تەقە بیسترا یەكێ لەگولەكان ڕێك لەسەرو سەرمەوە ڕۆیشتو بەر دیوارەكە كەوت. خۆمان بەرەو لای ڕاستو چەپ فرێدا.

من خێرا خۆم فرێدایە دەرەوە، نەمدەتوانی بەپێوە بوەستم بەڵام بەهەرحاڵێ بێ توانیم سەركەوتووبم، سەیرم كرد پۆلیسێك لە بەردەم دەرگاكەدا ڕاوەستاوە.

پرسی:

-هاتە ئێرە؟!

وتم:

-كێ؟!

-ئەو دزەی كە ڕاومان دەنا.

—نەخێر نەمدیوە ! !

—تۆ لێرە ئیشت چییە؟ !

—هاتم بۆلای هاوڕێیەکم.

—هاوڕێکەت؟؟ کەواتە تۆش لەوانەیت؟

پرسیم:

—لەکامانە؟

—کچم زۆرم لەگەڵ مەڵێ، دەزانیت ئێرە کوێیە؟

—نەخێر.

—ئێمە چەندجارێك ئێرەمان بەئامانج گرتووە، لێرە بازرگانی بەئافرەتەوە دەکرێت لەناکاو مێشکم جام بوو، سەرم گێژی خوارد، وتی:

—دەی لێرە دوورکەوەرەوە، وەك دیارە تازە تۆشیان خستۆتە ناو داوەکەوە کچم ئەمانە ئینسان لەناو دەبەن، ئەگەر دەتەوێت بەڕێزو شکۆمەندییەوە بژیت خۆت لەم کەسانە بەدووربگرە.

هەرچەندەش (بوراك) ئینکاری کرد بەڵام پۆلیسەکە ڕاستی وت، چونکە لەدوای منیش بینرابوو کە (بوراك) هەمان کاری پڕ شەرمەزاری ئەنجام دابوو.

کچە سادەکانی هەڵدەخەڵەتاندو بازرگانی پێوە دەکردن لەگەڵ دەوڵەمەندەکاندا، ئەو خانوەش بۆ هەمان مەبەست ڕازێنرابویەوە، لەگەڵ ئەوەشدا (بوراك) بەم هۆیەوە لەزانکۆ دەرکراو خرایە بەندیخانەوە.

ئەم ڕووداوە بووە وانەیەکی گرنگ بۆ من، بڕیارم دا هیچ کات وەڵامی دەعوەتی هیچ کوڕێك نەدەمەوەو لەگەڵیان نەچمە دەرەوە، سەرەڕای ئەمانەش سادەییەکەی جارانو دڵ ساف و بیرو بۆچوونەکانی جارانم بەڕادەیەکی زۆر گۆڕانیان بەسەردا هات.

بەتايبەت لەدوای جگەرەو عارەق، هەستم دەکرد کە بەتەواوەتی ئیمانم لاواز بووە، گوناهـەکان ئەوەنـدە چـووبوونە ڕۆحمـەوە کـە ناخمیـان ڕەش کردبوو، ئەمەش سەبارەت بە داهاتووم سەرەتایەکی زۆر خراپ بوو.

چووبوومە قۆنـاغی سـێیەم، لەوانەکانیشـمدا سـەرکەوتوبووم، هەسـتی هەندێك لە یاریدەدەرەکان(موعیدەکان) هێشـتا بەرامبـەرم بـەردەوام بـوو، هەروەها هەندێك لەکوڕەکان وازیان لێ نەدەهێنام.

بەتایبەتیش یاریدەدەرێکی قۆز بەردەوام تەکلیفی زەواجی لێ دەکردم خـاوەنی خێزانێکـی زۆر دەوڵەمەنـدبوو، بـەڵام مـن چـیتر دەترسـام بـەڵام ئەگەر کەسێکیش بهاتایەتە ڕێگەم کە خۆشیشم نەویستایە (نـا)م نـەدەوت چونکە چیتر بێزاربووبووم لەو کەسە هەلپەرستانەی دووروبەرم و دەمویست ئەو کارە تەواو بکەم.

## پیاوی ژیانم:

هەفتەیەك یاخود دە ڕۆژ بوو دەوامی زانکۆ دەسـتی پێکردبـوو، ئـەوە ئەو کاتەبوو کە نهێنی ژیانم دەستی پێ کرد.

ئەمە ڕووداوێکی وەهـابوو کـە هـەموو ژیـانمی لەسـەرەتاوە تـا کۆتـایی گۆڕی، ئاسۆی گەورەی لەبەردەممدا کردەوە، منی بەرەو شوێنێك برد کـە دەمێك بوو ئارەزووم دەکرد بەڵام بەخەیاڵمدا نەهاتبوو.

دوای نیوەڕۆ بوو.

هاتمە پۆلەوە، ڕێك بەرامبەرم بەکوڕێکی باڵابەرزی سپی پێسـتی بـەڕێز گەیشتم بێگومان ئەمە ناوی بەیەك گەیشتنی لێ نانرێت... وەك ئـەوە بـوو بەو گەنجە بگەم کە ساڵانێك بوو لەخەیاڵمدا وێنەم کێشابوو.

سەرنجەکانمان لەیەك کاتدا بەیەك گەیشتن... ئەو تەزووەی ئەوکاتە چەندشتێکی لەناخم پچڕاندو لەگەڵ خۆی بردی.. لەیەك چرکەدا سیحری لێکردم دەتوت ئەم مرۆڤە لە دونیایەکی ترەوە هاتووە... ئەوەندە کاری تێکردم لە چەند چرکەیەکدا دونیامی بەسەریەکدا دا.

وا بزانم هەرئەمەیە کەپێی دەڵێن خۆشەویستی یەکەم بینین، عیشق و گیرۆدەبوونی یەکەم بینین.

هەمووشتێك بێ قسەکردن، بێ یەکتر ناسینو بەیەك سەرنج ڕوویاندا، بەڵێ... ئەمە ئەو کوڕەبوو کە سالآنێك بوو بەدوایدا دەگەڕام.. ڕەنگە پەروەردگارم نەیویستبێ لەوە زیاتر بەڕێی چەوتدا لابدەم بۆیە ئەم گەنجە بێ کەمو کورتیەی بۆ من ناردبوو.

بەدرێژایی وانەکە نەمتوانی چاوم لەسەری لاببەم، لەهەر سەیرکردنێکدا دووبارە لەسەر خۆم دەچووم، خەریك بوو لەنێو بلێسەی خۆشەویستیدا نقوم دەبووم.

ئای خوایە گیان ئەوە چی بوو؟ ئەوەندە کتوپڕو لەناکاو بوو.

تا ئەمڕۆکە سەدەها لەدەورم دەهاتنو دەڕۆشتن، بۆئەوەی قسەم لەگەڵ بکەن و لێم نزیك ببنەوە لەگەڵ یەك پێشبڕکێیان دەکرد. لەمامۆستاکانەوە تا یاریدەدەرەکانیش بووبوومە داواکراوی هەمووان، بەلآم ئەمە یەکەم جار بوو شتێکی وام بەسەربێت.. مانای وایە یەکەم جارم بوو عاشق ببم و، دیاربوو ئەوانەی تر هەموو ساختەبوون.

## ئەم کوڕە ساحیرە کێیە؟

لەکچەکەی تەنیشتم پرسی:

–ئەم هاوڕێیە کێیە؟

–دەرچووی کۆلێژێکی ترە، دوێنێ هات، تۆ بۆیە نەتناسی چونکە دوێنێ لێرە نەبوویت لەدەرسا خۆی ناساند، کوڕێکی زۆر بەڕێزە، زۆر بەئەدەبەو خاوەنی زانیاری زۆرە، هەروەها زۆریش قۆزە!

لەبیرم نایەت ئەو وانەیە چۆن تێپەڕی، بەڵام بۆیەك دەقیقەش بێت چاوم لەسەری لانەبرد.

ئەو ڕۆژە بەم شێوەیە تێ پەڕی.

ئەوەندە عاشق بەو کوڕە بووبووم‌و ئەو شەوە لەخەونمدا بینیم، هەرچەندە دەمویست قسەی لەگەڵ بکەم‌و لێی نزیك ببمەوە نەمدەتوانی بەردەوام دوور لەمن دەوەستا.

بۆ بەیانیەکەی بەشەوقێکی زۆرەوە بەرەو زانکۆ ڕۆیشتم، لە خەیاڵی ئەوەدا بووم کە جارێکی تر بیبینمەوەو خۆمی پێ بناسێنم، ئەم خەیاڵ و ئەندێشەیەش خۆشییەکی زۆری پێ دەبەخشیم و هەستێکی شیرینی لەناخمدا دروست دەکرد کە نەمدەزانی ناوی چی لێ بنێم؟

بینیم زوو هاتبووە ناو پۆل، لەدواوە بەتەنیا دانیشتبوو، جگە لەخۆی چەند هاوڕێیەکی تریشی لێ بوو. بەڵام ئەو لەگەڵیاندا قسەی نەدەکرد، کتێبێکی بەدەستەوە بوو خەریك بوو دەیخوێندەوە.

چەند جارێك بەلایدا ڕۆشتم، بەدەوریدا سوڕامەوە دەمویست بڵێم "لێرەم... بۆ نامبینی" بەڵام ئەو هیچ سەیری نەکردم، ئەمە لەکاتێکدا کە من کچێکی زۆر جوان‌و قەشەنگ بووم، ئەگەر بەشوێنێکدا بڕۆیشتمایە

سەرنجی هەموو کوڕەکانم بەلای خۆمدا ڕادەکێشا، زۆربەی زۆریان ئاوڕیان بۆ دەدامەوەو سەیریان دەکردم.

## دەنگیو شیکردنەوەکەی منیان سەرسام کرد:

وانەی "فێربوونی زانستی ژیان" مان هەبوو، مامۆستای وانەکە هیچ خۆشی لە دینو کەسانی دیندار نەدەهات، لەهەر فرسەتێکدا بۆی هەڵبکەوتایە باسی بێباوەڕی دەهێنایە پێشەوە، قسەی تیانیە کە دەبوو هەموو وانەیەکی ئەم بابەتە بوروژێنێتو تێکڕای وانەکە بەموناقەشەی توند کۆتایی دەهات.

دووبارە لەوانەی ئەو ڕۆژەدا هێرش کرایە سەر دینو پیاوانی ئاینی، لەپۆلەکەدا دەمەقاڵێیەك لەنێوان قوتابیە ناڕەزاکاندا دەستی پێکرد کەس نەیدەزانی کێ چی دەڵێت. ! لەبەرئەوە مامۆستای وانەکە زۆر بێزاربوو.

لەدواوە دەنگێکی بەهێز بەڵام خۆشو کاریگەر، بەرزبویەوە:

-مامۆستا ئەگەر ئیجازە بدەیت! منیش دەمەوێت چەند ڕوونکردنەوەیەك سەبارەت بەم بابەتە بدەم.

دەنگی ئەوەندە کاریگەر بوو کە سەرنجی هەمووانی ڕاکێشا یاخود لەبەر ئەوەبوو کە من هەستێکی قووڵم بەرامبەری هەبوو بۆیە وام هەست دەکرد!

مامۆستاش وتی:

-بێگومان فەرموو تۆ تازە هاتویتە پۆلەوە باگوێ لە بیرو بۆچوونەکانی تۆش بگرین، من ئێستا هەموو قوتابیەکان دەناسمو دەزانم کێ چی دەڵێت، با لەتۆش تێبگەین.

-أستغفر الله، مامۆستا، بیروڕای من شتێك نییە لەگەڵ بیروڕای ئێوەو هاوڕێکاندا بەراورد بکرێت، تەنها دەمەوێت چەند ڕوونکردنەوەیەك بدەم، ئێمە چین تا لەبەرامبەر ئێوەدا کە مامۆستایەکی شارەزان لەبواری خۆتاندا موناقەشە بکەین ئێوە مامۆستان، ئێمەش قوتابی ئایا ئەمە هەموو شتێك ڕوون ناکاتەوە؟

## سەرەتا ڕێزێکی زۆری لەمامۆستا نا:

پێشەکییەکی زۆر باشبوو، سەرەتا بەڕێزنان لە مامۆستا دەستی پێکرد، بێ ئەوەی دەماری بگرێت بێ ئەوەی تووڕەی بکات شێوازێکی ڕەق بەکاربهێنێت.

دەست پێشخەریەکەی زۆر کاریگەربوو.

هەرچەندە تۆنی دەنگیو ئەو شێوازەی کە بەکاری دەهێنا دەری دەخست کە چەندە کەسێکی ڕێكو پێكو بەڕەوشتە.

وشەکانی ئەوەندە بەشێوازێکی نەرم دەوت، لەماوەیەکی کورتدا پۆلەکەی خستە ژێر کاریگەری قسەکانیەوە.

مامۆستاش زۆر ڕازی بوو لەو دەستپێکە جوانەیو ئارام بویەوەو لەسەر مێزەکەی دانیشت، ئێمەش هەموو بەسەرنجەوە لێمان دەڕوانی و بەپەرۆشەوە گوێمان لێ گرتبوو تا بزانین بابەتەکە بەرەو کوێ دەبات..

-مامۆستای زۆر بەڕێزم، نامەوێت ئێوەشو هاوڕێکانیشم قسەکانم بخەنە سەر خۆتان، قسەکانی من ڕەخنەگرتن نیە لەقسەی هیچ کەس، هەر هاوڕێیەك بیروڕایەکی خۆی هەیە کە بەڕاستی دەزانێت. بێگومانیش دەبێت هەی بێت، چونکە "مرۆڤ بچوککراوەی گەردوونە" و هەموو مرۆڤێك زەوقو

ڕەنگو هەڵبژاردنو بیروڕای سەربەخۆی خۆی هەیە ئەمانە پێویستی بوونی "مرۆڤ"ن.

ئێمە ئامێری مەکینە نین کە هەڵگری هەمان مۆدێلو هەمان بارهەڵگرو ستاندەربین تا تایبەتمەندییەکانیشمان وەك یەك وابن... لەبەرئەوە من شەخسی خۆم ڕێزێکی تایبەتیم هەیە بۆ ئەو کەسانەی کە هەڵگری دیدو بۆچوونی جیاوازن، بێگومان ئێوە لەپێش هەموانەوە...

ئەمە نزیك بوونەوەیەکی تا بڵێی تێگەیشتوانەو بێ پێشینە بڕیار بوو، لەبەرئەوەش هەمووانی وا لێکردبوو گوێ بیستی قسەکان بن.

وتی:

– بەڵام من سەبارەت بەم بابەتە ڕوونکردنەوەکەم بەم شێوەیەیە، بێگومان ئێوە لەسەرتان نیە پشتگیریم بکەن، هەرچەندە بۆئەوەش ئەم قسانە ناکەم کە پشتگیرم بکەن، ئەم قسانە دەکەم تەنها لەبەر ئەوەی ڕوونکردنەوەیەکی زیادە بخەمە سەر بابەتەکە تا گۆڕانکاریەك دروست ببێت.

هەمووان گوێیان لێ گرتبوو تابزانن "ئاخۆ دەیەوێت چی بڵێت؟"

–من وابیردەکەمەوە کە بۆ بیرۆکە گۆڕینەوەو ڕێ نیشاندان لەم بابەتەدا پێویستە مرۆڤ شارەزایی هەبێت.

لەڕاستیدا ئێوە کە مامۆستایەکی زۆر ڕێزدارن و شارەزان، ئەو بابەتانەی کە ئێوە لەباسی "فێربوونی زانستی ژیان" دا باسی لێوە دەکەن زۆر بەسوودو کاریگەرن بەڕاستی من لەبەرئەوەی ئەم وانەیە لەئێوەوە وەردەگرم هەست بەو پەڕی شانازی دەکەم.

بەپلانێکی زۆر وردو حسابی قووڵەوە قسەکانی دەکرد، دەیویست بڵێت کە گوێ گرتن لەئێوە کاتێك سەبارەت بە زانستی ژیان قسەدەکەن جوانە

بەڵام کاتێك سەبارەت بەبابەتی تر لەدەرەوەی وانە قسەدەکەن هەڵە دەکەن، ئەرکی ئێوە تەنها ئەوەیە وانەکەی خۆتان بڵێنەوەو باسی دین‌و ئەو بابەتانەی کە لەدەوری دین دەسوڕێتەوە بەجێی بهێڵن بۆ کەسانی شارەزا لەو بوارەدا، دەیویست پەیامەکەی بگەیەنێت بەڵام ئەوەندە بەجوانی‌و وەستایانە دەری دەبڕی کە هەستی کەسی بریندارنەکرد.

## نزیك بوونەوەکەی سەرسوڕهێنەربوو:

تەنانەت مامۆستا ڕواڵەتی دەربڕینەکەی بەپیاهەڵدان زانی‌و بەهێواشی سەری جولاندو وتی:

–سوپاست دەکەم.

ئەو کوڕەی کە لەمێشکمدا وێنەکەی‌و لەدڵمدا خۆشەویستییەکەی هەڵکەندرابوو کوڕی ناو ڕۆحم کە تەنانەت نەشمدەزانی ناوی چیە، لەقسەکانی بەردەوام بوو.

–ئەو شتەی کە دەمەوێت عەرزی بکەم ئەوەیە کە: ئەگەر لێرە نەخۆشێك هەبێت بۆ دەستنیشانکردنی نەخۆشیەکەی و تیمارکردن و چارەسەرکردنی بێگومان پزیشکێك بانگ دەکەین.

ئەگەر بێت و لەجیاتی پزیشك سەد ئەندازیاریش بانگهێشت بکەین لەبەر ئەوەی لەبابەتەکەدا شارەزانین نەدەتوانن نەخۆشییەکەی دەستنیشان بکەن نەدەتونن چارەسەریشی بکەن.

ئەگەر هەڵسن بە تیمارکردنیشی یەکەم جار خۆیان لە کەدار دەکەن دواتریش ژیانی نەخۆشەکە دەخەنە مەترسییەوە.

ڕێك وەك ئەو نموونەیە ئەگەر بۆ وتنەوەی وانەی زانستی ژیان‌و پێدانی زانیاری بەسوود لەو بارەیەوە پیاوانی ئاینی، تەنانەت زانایەکی دینیش

بانگهێشت بکەین هەڵە دەکەین، چونکە مەودای شارەزایی ئەوکەسانە لەبواری دین‌و بابەتە دینییەکاندا، بۆ وەرگرتنی زانیاری سەبارەت بە (زانستی ژیان) لەپیاوێکی ئاینی نا بەڵکو لەشارەزایەکی بەڕێزی وەك ئێوە پێویستە وەربگیرێت، چونکە تەنها ئێوە لەم بوارەدا خاوەنی بیرورِان.

ڕوونکردنەوەیەکی زۆر جوانی پێشکەش کردو لەکاتی ڕوونکردنەوەکەدا زۆر بەوردی قسەی دەکرد هەم دڵی مامۆستای ڕاگرت هەمیش باسی گرنگی قسەکردنی هەرکەسێکی کرد لەبواری خۆیدا، لەکۆتاییدا وتی:

—من بەم شێوەیە حەزم لێیە لەم بابەتە نزیك ببمەوە، هەر هەڵەیەکیشم کردبێت داوای لێبوردن دەکەم و، سوپاستان دەکەم بۆئەوەی گوێتان لێگرتم.

بەمەعنای کەلیمە ڕێك‌و پێك‌و سەرسورِهێنەربوو...

بێ دەنگی باڵی بەسەر پۆلەکەدا گرت‌و لەسەرو هەمووشیانەوە مامۆستا.

ئەو برادەرانەی کە بەشێکی زۆریان وەك مامۆستا بیریان دەکردەوە پەیامەکەیان پێ گەیشت، بەلاَم بەهۆی ئەو نزیك بوونەوە جوانەیەوە هیچ کەس بەرپەرچی نەدایەوە.

مامۆستا ئەگەر چی بە زۆریش بێت وتی:

—سوپاست دەکەم.

لەوکاتەدا وانە تەواو بوو چووینە دەرەوە.

## بەشەوقێکی زۆرەوە خۆم پێ ناساند:

ئەو هاوڕێ پڕ نهێنییەی کە تازە هاتبوو، بووبووە جێی سەرنجی هەموو پۆلەکە بەتایبەتی کچەکان، بەدەوریدا دەسوڕانەوە یاخود لەبەر ئەوەی من بەغیرەوە سەیرم دەکردن وام دەبینی.

نەمدەتوانی لەوە زیاتر بەرگە بگرم، بۆنەوەی لەدەستم دەرنەچێت هەموو ئازایەتیم کۆکردەوەو بڕیارم دا بڕۆم بۆلای‌و خۆمی پێ بناسێنم، بەڵام دەوروبەری ئەوەندە قەرەباڵغ بوو هەلم بۆ نەڕەخسا، بەڵام هەرچیم بکردایە دەبوو ئەو ڕۆژە خۆمم پێ بناساندایە.

لەکۆتاییدا لەوانەی سێیەمدا فرسەتێکم دۆزییەوە، کاتێك بەو نیەتەوە بەرەو لای دەڕۆیشتم جۆش‌و خرۆشێك هەموو جەستەمی داگیرکردبوو کە باس ناکرێت، هەستم دەکرد هەموو لاشەم دەلەرزێت.

وتم من (جانان)م... بەشلەژاوییەکەوە وتم دەتوانم بتناسم؟

سەرنجێکی دام و خێرا سەری داخست و وتی:

—من مەسعودم، ئەمەی وت‌و بێدەنگ بوو.

من نەمدەویست وازی لێ بهێنم، خۆم کۆکردەوەو بەردەوام بووم لە قسەکردن، سەیری دەم و چاویم کردو وتم:

—ڕوونکردنەوەکانت سەرسوڕهێنەربوون.

بەڵام ئەو دیسانەوە سەری دانەواندبوو، بەدەنگە تێرو کاریگەرییەوە وتی:

—زۆر سوپاس، ئێوە جوان لێکتان داوەتەوە، ئەگەرنا ڕوونکردنەوەکانم بەو شێوەیە سەرسوڕهێنەر نەبوون.

—نەخێر، بەبڕوای من زۆر سەرسوڕهێنەربوون، تەنانەت مامۆستاو هەموو هاوڕێیانیش کاریگەربوون پێی.

—لەبەرئەوەی تازە هاتومەتە ئێرە، مامەڵەی میوانیان لەگەڵمداکردو نەیانویست بمشکێنن بەواتایەکی تر موبالەغەیانکرد.

زۆر خاکی بوو، بونیەتێکی وای هەبوو کە هەموو هەڵسوکەوتەکانی ئامۆژگاری بوون نەمدەتوانی لەسەیرکردنی خۆم ڕابگرم.

—دەتوانیت کەمێك باسی خۆتم بۆ بکەیت؟

ئەو پرسیارەم کرد چونکە نەم دەویست کۆتایی بەقسەکان بهێنمو لەوێ بڕۆم.

ئەو بەهەمان خاکێتییەوە وەڵامی دایەوە:

—من شتێکی وەهام نیە کە شایەنی باسکردن بێت، وانازانم ئەو شتانەی کە باسیان دەکەم سەرنجتان ڕابکێشێت.

لەناکاو لەدەمم دەرچوو وتم:

—چۆن شتی وادەبێت! هەرچییەك ئێوە باسی بکەن، سەرنجی من ڕادەکێشێت.

خێرا خۆم کۆکردەوەو هەوڵی ڕاستکردنەوەیم دا:

—واتە هەموو مرۆڤێك بابەتگەلێکی گرنگی هەیە کە شایەنی باسکردن بێت.

—بەداخەوە من باسێکی لەو جۆرەم نیە.

لەکاتی وەڵامدانەوەکەیدا جۆرێك بوو وەك بڵێت "بێزارت کردم، لەکۆڵم بەرەوە"

منیش پێش ئەوەی لەوەزیاتر لەبەرچاوی بچوك ببمەوە وتم:

—خۆشحاڵ بووم بەناسینت.

ئەویش وتی:

—منیش هەروەها.

دووباره بیّ ئەوەی سەیرم بکات.

وەك ئـەوەی لـە مەسـعوددا هێزێکـی سـیحراوی‌و هێزێـك کـە ئینسـانی بەرەو خۆی ڕادەکێشا هەبوو، نەمدەتوانی دان بەخۆدا بگرم، شەوو ڕۆژ لە هەموو شوێنێك‌و لەهەموو کاتێکدا لەخەیاڵمدا بوو، من چیتر لەوە زۆر باش تێگەیشتبووم کە دەبێت هاوبەشی ژیانم مەسعود بێت بۆ ئەوە ئامـادەبووم هەزارجار گیـانم ببەخشـم، بەشـێوەیەك دەبـوو ڕێگـای نزیـك بوونـەوە لـەو بدۆزمەوەو ببمە هاوسەرێك کە شایەنی ئەو بێت.

## گفتوگۆیەکی پڕمانا:

ئـەمجارەیان وانـەی "پـەروەردەی زانسـت" مـان هـەبوو. مامۆسـتای وانەکە باسی ئەوەی دەکرد کە "گەردوون لەخۆیەوە پەیـدابووە پێویسـتی بەهیچ بەدیهێنەرێك نییە، خـودا لەلایـەن مرۆڤەکانـەوە داهێنـراوە شـتی وا ئەسڵ‌و ئەساسی نیە"

دووباره لەپۆلدا کۆمەڵێك لەقوتابیان ئەم قسانەیان بەدڵ نەبوو، کاتێـك مامۆستاش بەشێوازێکی توند وەڵامـی دانـەوە بـارودۆخی پۆلەکـە بـەرەوە تێکچوون ڕۆیشت.

لەوکاتەدا مەسعود دەستی بەقسەکردن کرد.

دووباره بەپیاهەڵدانی مامۆستاو نزیك بوونەوەیەکی پڕ ڕێزو بەو دەنگە سیحراوییەی بیّ ئەوەی کەس بشکێنێت‌و هەستی کەس بریندار بکات وتی:

- بـا لـە بابەتەکـە تـیّ بگـەین زۆر خۆشـحاڵ دەبم ئەگـەر بـۆم ڕوون بکەیتەوە.

مامۆستا کەمێك تووڕەییەکەی ڕەوییەوەو، پرسیاری کرد:

-کام بابەتە؟

—ئەو بابەتەی کە باس لەوە دەکات گەردوون لەخۆیەوە دروست بووە، نەکا من هەڵە تێگەشتبم؟

مامۆستا وتی:

—نەخێر، ڕاست تێگەیشتویت، گەردوون لەخۆیەوە دروست بووەو هیچ پێویستییەکی بەدروستکار نییە.

—داوای لێبوردن دەکەم... من لەبەر ئەوەی شارەزای بابەتەکە نیم لەوانەیە هەڵە بکەم ئەگەر هەر هەڵەیەکم کرد تکایە بۆم ڕاست بکەرەوە.

واتە دەتوانین بابەتی لەخۆوە دروست بوونی گەردوون بەم نموونەیە بچوێنین.

هەموویان سەیری مەسعودیان دەکرد بەمامۆستاشەوە تا بزانن چ نموونەیەك دەهێنێتەوە!

—ئەگەر بڕیاربدەین بینایەکی وەك ئەم زانکۆیە دروست بکەین، بۆ ئەو مەبەستەش هەموو پێداویستییەکانی وەك بلۆك، لم، چیمەنتۆ، شیش... هتد. بخەینە پاڵ یەك ئەگەر پلانێك لە ئارادا نەبێت و کۆمەڵێ وەستاو کرێکار نەبن ئەمانە بخەنە پاڵ یەك، ئێوە دەڵێن ئەو بینایە دەتوانێت لەخۆیەوە دروست ببێت؟

بێدەنگیەکی قووڵ پۆلەکەی داپۆشیبوو.

مەسعود بێدەنگ بوو تابزانێت کەسێك هەیە کە بەپەرچی بداتەوە؟ دواتریش بەردەوام بوو.

—یاخود با نموونەکە بەشێوەیەکی ڕوونتر باس بکەین:

لەبەرامبەرمدا تەختەڕەشی پۆلەکە هەیە، لەتەنیشتیشیدا دەباشیر هەیە ئەگەر کەسێك نەبێت کە نووسین بزانێت، ئەو دەباشیرە لەخۆیەوە دەتوانێت هەستێت و لەسەر تەختە ڕەشەکە بنووسێت؟

دووباره بێدەنگی بەردەوام بوو.

—من دەڵێم تۆ بڵێی بۆ دروستبوونی ئەو سیستمو هەماهەنگییە سەرسوڕهێنەرەی لەم گەردوونەدا بەدیدەکرێت پێویست بەوەستایەکی زۆر عاقڵو پلان دارشتن نیە! تۆبڵێی ئەم گەردوونە ڕێك و پێك و ناوازەیە لەخۆیەوە پەیدابووبێت؟

بەواتایەکی تر ئایا ڕۆزییەکانی وەك: ئاو، هەوا، خۆراك، کە بۆ ئێمە دەستەبەرکراون لەخۆیانەوە پەیدابوون یاخود بەدەستی خاوەن هێزێك کە پێداویستییەکانی ئێمە زۆر باش دەزانێت دروستکراون.

من لەم بابەتەدا کەمێك نەزانم، مامۆستا دەکرێت کەمێك هاوکاریم بکەن؟

مامۆستا وەك ئەوەی لێ هاتبوو کە گورزێکی قورسی بەرکەوتبێت تۆ هاوکاری کردن بخەرە لایەکەوە ئەو تەنانەت حاڵی قسەکردنیشی نەمابوو هەندێك شتی وت کە بۆ خۆیشی تێنەگەیشت دەڵێت چی دواتریش وتی:

—هەفتەی داهاتوو دەتان بینمەوەو، پۆلی بەجێ هێشت.

## بڕیام دا لەگەڵ مەسعوددا بکرێمەوە:

مەسعود زۆر عاقڵو زۆر زیرەك بوو، زۆرباش دەیزانی چ شتێك لە چ کاتێکدا بڵێت.

خۆی زۆر بەباشی پەروەردەکردبوو، لە هەموو پشوویەکدا کتێبی دەخوێندەوە مەسعود لەپۆلدا وەك کەسێکی زاناو تێگەیشتوو، ڕێزو خۆشەویستی هەمووانی بەدەست هێنابوو، تەنانەت هەندێك لە مامۆستا یاریدەدەرەکان لەو وانانەی کە مەسعودی تێدابوو وایان لێ هاتبوو نەیان دەوێرا مەوزوع بکەنەوە.

مەسعود لەماوەیەکی کەمدا، هاوڕێیەکی زۆر لەدەوری کۆبوونەوە، لەناو ئەوانەدا کەسانێکیش هەبوون کە خاوەنی بیروڕای پێچەوانەبوون.

مانای وابوو ئەوانیش بەقسەکانی کاریگەر بووبوون‌و بەخۆیاندا چووبونەوە چونکە ڕەوشتەکانی وەك نەشکاندنی دڵی کەس‌و نەهێشتنی پێشینە بڕیار سەرنجی ئەوانی بەلای خۆیدا زیاتر ڕادەکێشا.

بەڕاستی مەسعود کەسێکی دیموکرات خوازبوو، دەیویست هەموو کەسێك وەك مرۆڤ مامەڵەی لەگەڵ بکرێت و، هەڵبژاردن‌و بیرو بۆچوونەکانیان بەئازادی وەربگیرێت، بەدڵنییایشەوە ئەوەی کە کۆمەڵێك گروپی بەلایدا ڕاکێشابوو هەر ئەم هۆکارانەبوون.

نەمدەتوانی زیاتر لەمە بەرگری ئەو لافاوی خۆشەویستییە بکەم کە بەخێرایی زیادی دەکرد، بڕیارمدا پێش ئەوەی کەسێکی تر دڵی داگیربکات، لەگەڵیدا بکرێمەوە، چونکە مەسعود بەشێوەیەك دونیای منی داگیرکردبوو کە نەمدەتوانی جگە لەو لەگەڵ هیچ کەسێکی تردا بیر لەهاوسەرگیری‌و دڵخۆشییەکی تر بکەمەوە.

بۆ ئەو مەبەستەش پلانێکم داڕشت.

بڕیارم دا بەبیانووی واجبێك کە مامۆستا پێی دابوین، داوای یارمەتی لە مەسعود بکەم‌و بەوهۆیەشەوە بابەتەکەی لەگەڵدا باس بکەم.

ئەو شەوە نەمتوانی بخەوم، بە وردی بیرم لەهەموو ئەو شتانە کردەوە کە بڕیارم دابوو باسی لێوە بکەم، و بیرم لەهەموو پەرچەکردارێك کە ئەگەری ڕوودانی هەبوو کردەوە.

مەسعود گەنجێکی دیندار بوو، منیش ئینکاری خوداو دینم نەدەکرد، بەڵام ئەرکە دینیەکانم بەشێوەیەکی ڕێك و پێك بەجێ نەدەهێنا، تەنانەت جگەرەکێشان و عارەق خواردنەوەشم هەبوو، ئەگەر مەسعود منی

بناسیایە ئەم ئیشە سەری نەدەگرت، تەنها ترسێك كە هەم بوو ئەمەبوو، بەڵام من ئامادە بووم بۆ دەستبەردان لەهەموو شتێك ئەگەر وەڵامێكی ئیجابیم لەوەوە دەستبكەوتایە.

## خەریك بوو لەتاوا دڵم دەوەستا:

ئەو ڕۆژە وانەكانمان تەواو بووبوو، هەمووان خۆیان ئامادەكردبوو بۆ ڕۆیشتنەوە منیش ئەمەم بەفرسەت وەرگرت‌و چوومە لای مەسعود، وتم:

—واجبێكم هەیە، دەتوانیت لەم بابەتەدا هاوكاریم بكەیت؟

بەجۆرێك سەیری كردم، لەحاڵێدا دیاربوو كە خۆشی لەداواكارییەكەم نەهات‌و پرسی:

—ئێستا؟

وتم:

—بەڵێ.. هەڵبەت ئەگەر بەئەرك نەبێت، چونكە كاتم كەم بەدەستەوە ماوە.

بەشێوازێكی كەمێك سەرسوڕماویەوە پرسی:

—واتا من‌و تۆ بەیەكەوە سەعی بكەین؟

—بەڵێ!

سەری داخست‌و وتی:

—بڕوانە.. خاتوو جانان ڕەنگە كەمێك بەقورسی لێم تێ بگەیت یاخود لەتێگەیشتن كەمێك زەحمەت بكێشیت لەبەر ئەوەش بمبوورن، من بیروباوەڕەكەم ڕێگەم نادات كە بەتەنها لەگەڵ كچێكدا لەشوێنێك كە كەسی لێ نیە بمێنمەوە، ڕەنگە ئەوە بەلای ئێوەوە سەیر بێت بەڵام ئەمە بنەمایەكی گرنگە لە ژیانی مندا.

تەنها لەبەرئەوەی پەشیمان نەبێتەوە خێرا وتم:

—بێگومان.. ڕەنگە ئەمە بنەمایەکی پیرۆز بێت بەلاتانەوە، من لەئێوە تێدەگەم و زۆر ڕێـزیش لـە بیروبۆچـوونەکەتان دەگـرم، خۆزگـە هـەموان وەکو ئێوە بوونایە، ئەوکاتە زۆرێك لـە کێشـە کۆمەڵایەتیـەکان چارەسـەر دەبوون.

مادام ناتەوێت بەتەنیا لەگەڵمدا سەعی بکەیت دەتوانم کچێکی هاوڕێشم لەگەڵ خۆمدا بهێنم.. ئەگەر ئەویش بێت تۆ ڕازی دەبیت؟

دووبارە سەری دانەواند دیـاربوو کـە لەحاڵـەتێکی ناچـاریدابوو، لەبـەر هەوڵی بەردەوامی من ناچار بوو ڕازی بێت. وتـی:

—دەتوانیت.

زۆر دڵم بەوە خۆش بوو، دڵخۆش بوون لەلایەك بوەسـتێت خـەریك بـوو لەتاودا دەبورامەوە، یەکسەر یەکێك لـەهاوڕێکانم بـانگ کـرد، بەشـڵەژاویو دڵـەڕاوکێوە پێکـەوە دانیشـتین. لەڕاسـتیدا ئامـانجی مـن واجـبو شـتی وانەبوو، دەمویست لەو ڕێیەوە خۆم نیشـان بـدەمو سـەرنجی ڕابکێشـم و، ئەگەر هەر فرسەتێکیشم بۆ هەڵبکەوتایە هەستی خۆمم بۆ دەردەبڕی.

لەکاتژمێرێك زیاتر قسـەمان کـرد، گوایـە سـەبارەت بـە واجبەکـە بـوو، لەنێوەندی قسەکانیشدا هەندێك پرسیارم لـەخۆم دەکـرد، بـەڵام ئـەو هـەر بـەوەڵامی کـورتو هـەڵهاتن لەپرسـیارەکان وەڵامـی دەدایـەوە، لەمێشـکی ئەودا "من" بوونم نەبوو، زۆر باش لەوە تێگەیشتبووم بـەڵام توانیشـم وای لێ بکەم هەسـت بەهەسـتو سـۆزی مـن بەرامبـەری بکـات مەسـعود لـەوە تێگەیشتبوو، ئەوەش بۆ من سەرەتایەکی زۆر گرنگ بوو.

کاتێك جیابووینەوە سوپاسم کـردو بـۆ چرکەیەك بـەدوایی چـاوەکانیدا گەڕام، دەمویست بەم شێوەیە کۆتا پەیامی پـێ بگەیـەنم، سـەرنجەکانمان

لە هەوادا بەیەك گەیشتو پاشان سەری داخست، بەم شێوەیە پەیامەکە گەیشتبووە شوێنی خۆی.

مەسعود گەنجێکی زۆر جیاوازبوو. دان بەخۆداگرتنی بەرامبەر داوای کچێکی جوانو قەشەنگی وەك من بەڕاستی شایەنی ڕێزلێنان بوو.

لەناخی مەسعوددا باوەڕێکی زۆر بەهێز هەبوو، ئەویش پارێزگاری لەو باوەڕەی دەکرد، هەر ئەو ڕەوشت بەرزی و ڕاستگۆییەی گەورەترین هێزبوو کە منی بەلای خۆیدا ڕاکێشا.

کاتێك خەریك بوو جیادەبوینەوە خەریك بوو دڵم دەوەستا، وابزانم کە مەسعودیش هەستی بەوەکردبوو کە بەزەردەخەنەوە ماڵئاوایی لێ کردم.

## وەڵامە سەرسوڕهێنەرەکان:

کۆتایی ساڵ نزیك بووبوویەوە.

لە ڕۆژەکانی کۆتاییدا وانەکان تەواو بووبوونو بەگشتی موناقەشە دەکرا. مامۆستاکان لەوانەکاندا دەیانویست بیروبۆچونی ئێمە لەسەر کێشە گشتیەکان وەربگرن، بەواتایەکی تر ئێمە ئامادەبکەن بۆ گەشەپێدانی بیرکردنەوەو ڕوون کردنەوەو دۆزینەوەی چارەسەر.

هەندێکی تریش لەمامۆستا مولحیدەکان دەیانوسیت بیری بێ باوەڕیو ئایدۆلۆژی لە مێشکماندا بچەسپێنن، بەڵام ئەوە ئاسان نەبوو لەو وانانەی کە مەسعود تیایاندا بەشداریی دەکرد، مەسعود بەو دەنگە سەرنج ڕاکێشو ڕەوشتە کاریگەرانەیەوە وەڵامی زۆر جوانی دەدانەوەو هەم ڕێزی قوتابیەکانو هەم ڕێزی مامۆستاکانی بۆخۆی تۆماردەکرد.

لەوانەیەکی تری لەو شێوەیەدا بووین.

مامۆستای وانەکە دووبارە بیری ئایدۆلۆژیای ڕوون دەکردەوە، لەکاتی باسکردنیشدا قسەکانی دەخستە ئەستۆی دینو زانایانی ئایینی، وەکو هەمیشە:

—دیندارەکان پێیان خۆشە هەمووشتێك بەخواوە ببەستنەوە، بەلای ئەوانەوە لەگەردووندا چی هەیە بەبڕیاری خودا دەبێت، هەرشتێك لەزەمینو ئاسمان هەیە فەرمان لەوەوە وەردەگرێت، هەر کاتێك ئەو فەرمان بدات ژیان کۆتایی پێ دێت.

لەلایەکیشەوە پێ دەکەنی وەك بڵێیت: "ئەم بیروباوەڕە چەندێ بێ عەقڵانەیە".

—با وای دابنێین شتانێك بەمرۆڤ و گیانەوەرەکان دەبەخشێتو لێیان دەستێنێتەوە باشە ئەی بۆچی خۆی مەشغوڵ بکات بەو هەسارە بێ گیانانەو ئاسمانەوە، دواتریش خوا چی لەو هەسارە سوڕاوانە دەوێت؟ ئەوانە بۆخۆیان خەریکن دەسوڕێنەوە ئیتر نە ئەوان پێویستان بەخوایەو نە خواش بەوان!

لەڕاستیدا مامۆستا دەیویست بڵێت گەردوون لەخۆیەوە بەڕێوە دەبرێت لەبەرئەوە چ پێویستیەکی بەخودا هەیە؟

چاوی هەمووان دووبارە بەدوای مەسعوددا دەگەڕان، بێگومان ئەویش ئەوکەسانەی نیگەران نەکرد کە باوەڕیان پێی بوو.

بەشێوازە لەسەرخۆکەیی و هەڵسوکەوتە ناسراوەکانی چووە ناو باسەکەوە بەنزیك بوونەوەیەکی کاریگەرەوە وتی:

—بەڕێزێکی گەورەوە دەڕوانمەوە مامۆستای ڕێزدارمان لەبەر کردنەوەی ئەم موناقەشەیەو ڕێپێدانمان بۆ قسەکردن تیایدا، ئەمە دەری دەخات کە مامۆستاکەمان چەندە تێگەیشتوو بیر تیژەو چەندە گرنگی

بەپێگەیاندنی ئێمە دەدات، لەبەر ئەوە نەك تەنها سوپاسگوزار بەڵكو ئێمە قەرزاری ئەویشین.

بێگومان دووبارە مامۆستا بەپیاهەڵدانەکانو قسەجوانەکانو بەرز ڕاگرتنی فرپیە هەواوەو زەردەخەنەیەکی شیرین لەسەر ڕووی دەرکەوت.

مەسعود وتی:

—بیرو بۆچوونەکانی من لەم بارەیەوە بەم شێوەیە:

—ئەگەر لەگەردووندا سیستمێكو هەماهەنگیەك هەبێت مانای وایە هێزێکیش هەیە کە پلانی بۆدانابێتو بەڕێوەی ببات و ڕێکی بخاتەوە، ئەمە لەکاتێکدا لە هەر زانستێك بڕوانیت، دەبینیت کەباس لەبێ کەمو کورتی گەردوون دەکات.

بێگومان زاتێك ئەم سیستمە سەرسوڕهێنەرەی دروست کردبێتو بەڕێوەی ببات لە بچوکترین گەردەوە تا گەورەترین مەجەرەی لەژێر دەستیدایە، ئایا ئەگەر کەسێك کارێك بکات، دواتر هەموو کارەکەی بەزایە دەدات؟

ئەگەر بمانەوێت بەنموونەیەکی ڕوونتر ڕونی بکەینەوە.

دەوڵەمەندێك کە کارگەی شەکر دروستکردنی هەیە، دەچێت ئەو شەکرەی کە بەرهەمی هێناوە فڕێ بداتە جۆگەوە؟ بێگومان بۆ بەدەستهێنانی ئامانجی خۆی بەو جۆرەی کە دەیەوێت بەکاری دەهێنێت.

مامۆستای بەڕێزمان باسی تەنەکانی ئاسمانو مەجەڕەکانی کردو، وتیان کە نە خودا پێویستی بەمانە هەیەو نە ئەمانەش بە خودا.

بێگومان ئەمە بیروڕای مامۆستای بەڕێزمانە بەڵام بیروڕای من بەم جۆرەیە:

لەئاسمانـدا بـەملیارەها مەجـەرەو لـەناو هـەر مەجەڕەیەکیشـدا بـە ملیارەها ئەستێرە هەن کە جوڵەکانیان بەیاسا و ڕێسایەو پەیامێکی گرنگە بۆ خاوەن ژیریەکان.

بۆئـەوەی بـزانین کـە تەنـەکانی ئاسمـان چـەندە بەسیسـتمێکی سەرسوڕهێنەر بەڕێوە دەبرێن، وردبونـەوەمان لـە مەجـەڕەکانی نزیکمـان بەسە بۆمان.

لەشەوێکی پرشنگداردا، ئەو کۆمەڵە ئەستێرانە دەبینین کـە لەشـێوەی شریتدا درێژبونەتەوەو بە ئاسماندا دەڕۆن، وەك تـوڵێکی درەوشـاوە درێـژ کشاون و ئاسمانیان ڕازاندووەتەوە.

لەناو مەجەڕەدا ٢٠٠ ملیار ئەستێرە هەیە کە گـەواهی بـۆ بەدیهێنـەری گـەردوون دەدەن، خـۆری ئێمـە یەکێکـە لـەو ئەسـتێرانە، مەجەڕەکـەی ئێمەیش تەنها بەپێی ئەو زانیارییانەی کە ئەمڕۆکە پێی گەیشتوون یەکێکە لەو ١٠٠ملیار مەجەڕانە.

مەجەڕەکەی ئێمە کە ناوی (ڕێـی کاکێشـانە) کـە دەچـێتە سـەرگروپی مەجەڕە لوول پێچەکان لەناوەندیدا شێوەیەکی دیسـکی هەیـە و لـەدوولای ئـەم دیسـکەوە قـۆڵی لوولپێچـی بـەدی دەکرێـت، ئەسـتوری دیسـکەکەی ناوەڕاسـت دەهـەزار سـاڵی تیشـکییەو تـیرەی هـەموو مەجـەڕەکانیش ١٠٠هەزار ساڵی تیشکییە، ئەگەر بمانەوێت بەرۆکێتێك بـەخێرایی دە هـەزار کم لەکاتژمێرێکدا لەسەرێکی مەجەرەکەوە بەرەو سەرەکەی تـری بکەوینـە ڕێ، ئەم سەفەرە بەتەواوی لەپازدەملیارو هەشت سەد ملیۆن ساڵدا تـەواو دەبێت.

لـە مەجەڕەکـەدا دوو گەلـە ئەسـتێرە هـەن کـە بەزەبـەلاحی سـوورو زەبەلاحی شین ناسراون، زەبەلاحی سوور زیاتر لەناوەندا کۆبووەتەوە.

بـەڵام بـەهۆی ئـەوەی لـەم بەشـەدا هـەوری گـازو ئـۆزۆن زۆر چـڕە نابینرێت.

تەنها دەتوانرێت بەیارمەتی فۆتۆئەلەکتریك، تیشكی سورو تەلەسكۆبە ڕادیۆییەكان بسەلمێنرێت.

سیستمی خۆرمان ٢٦هەزار ساڵی تیشكی لەناوەندی مەجەڕەكەمانەوە دوورە، ئـەو ٢٠٠ملیـار ئەستێرەیەشـی كـە مەجەڕەكـە دروسـت دەكـەن، بەبـەردەوامی لەحاڵـەتی سـوڕانەوەدان بـەدەوری ناوەنـدی مەجەڕەكـەدا، خێرایـی ئـەم سـوڕانەوەیەش تـا لـە ناوەنـدەوە بـەرەو لێوارەكـانی بـڕوات خاوتر دەبێتەوە.

خێرایی سوڕانەوەی خۆری ئێمە لەگەڵ هەسـارەكانیدا بـەرەو ناوەنـدی مەجەڕە (٢٨٠كم)ە لەچركەیەكدا، خۆری ئێمە لـە سـوڕانەوەیەكدا بەتـەنها ٢٢٥ملیۆن ساڵ تەواو دەكات كە پێی دەوترێت "ساڵی كۆزمیك".

ئەمـە چـەندە یاسـایەكی سەرسـوڕهێنەرە كـە یـەك ئەسـتێرە هـەم بـەدەوری خولگـەی خۆیـدا دەسـوڕێتەوە هـەم لەكاتێكـدا هەسارەكانیشـی بەدەوریـدا دەسـوڕێنەوە دەتوانێـت بەخێراییـەكی ڕێـكو پێـك بـەدەوری مەركەزیشدا بسوڕێتەوە، لەكاتێكدا كـە كەسـێكی خـاوەن ژیـری ناتوانێـت لەیەك كاتدا دوو كار بكـات، مەجـەڕە ملیارەهـا ئەسـتێرە لـەخۆ دەگرێـت، هەر ئەستێرەیەكیش دەتوانێت ئەو هـەموو كـارە لەیـەك كاتـدا بـێ تێكـەڵ كـردن بكـات شـایەنی ئەوەیـە بـیری لـێ بكرێتـەوە، ئـەم ڕێسـایانە كـە لەمەودایەكی فراواندا ڕێ دەكەن پابەندن بەوردەكاری زۆر هەستیارەوە.

نكـوڵی كـردن لـەم نەخشەسـازی و وردەكارییانـە، نكـوڵی كـردن لـە هەبوونی گەردوون پێكـەنیناوی تـر دەبێـت، ناكرێـت ئـەو وردەكارییـە بـێ هەڵانـەی كـە لەهەرگۆشـەیەكی گەردوونـدا بـەدی دەكـرێن بـە ڕێكـەوت لـە

قەڵەم بدرێن، ئاشکرێت ئەمانە پاشماوەی ئەستێرە بێ گیانەکانو گازو تەپوتۆزبن. کەواتە بوونی بەدیهێنەرێك کە هەموو گەردوونی بەحسابێکی ورد ڕێکخستووە پێویستە، ئەگەر نا نەك تەنها گەردوون نەدەبوو بەڵکو تەنها ئەستێرەیەکیش بوونی نەدەبوو.

هێزێك کە دەسەڵاتی بەسەر هەموو گەردووندا دەشکێت هەروەك چۆن ئەلەکترۆنەکان بەدەوری ناوکدا دەسوڕێنێتەوە، ئاواش هەسارە گەڕۆکەکان بەدەوری خۆرداو خۆریش بەدەوری مەجەڕەدا دەسوڕێنێتەوە، ئەو بەدیهێنەرە جوانسازەی کە گەردوونی وەك کۆشکێکی سەرسوڕهێنەر و نەخشێنراو دروست کردووە، هەروەك چۆن زەوی بەتوێکڵی لوولپێچ داپۆشیووە، هەمان شتیشی لە مەودای ١٠٠هەزار ساڵی تیشکییەوە لەسەر مەجەڕە نەخشاندووە. ئەمە چەندە هێزێکی سەرسوڕهێنەرە، هەروەك چۆن خڕۆکە سوورەکانی خوێنمان هەموو ڕۆژێك لە لوولە خوێنەکاندا کە چەندەها کیلۆمەتر ڕێگە دەبڕن، هەرواش ملیارەها گەلەئەستێرە بەدرێژایی ملیارەها ساڵە دەسوڕێنەوە، لەسەرو هەموو شتێکیشەوە بەجوانترین شێواز پەخشکراون.

لەکاتێکدا گۆی زەوی بەچەند جووڵەیەکی سەرنج ڕاکێش بەو خێراییەیە لە بۆشایی ئاسماندا دەسوڕێتەوە، ئێمە سەرمان گێژ ناخوات و نابینین، بەڵکو بەپێچەوانەوە چەندەها لاپەڕە دەخوێنینەوە کە بە نەخش و نیگار ڕازێنراوەتەوە و وەك پێشانگایەکی پڕ گەوهەر سەیری دیمەنی سەرنج ڕاکێشیان دەکەین، ئەگەر مرۆڤەکان سەرسوڕماوی خۆیان لەبەرامبەر ئەم دیمەنە شیرینانەدا نیشان نەدەن! ئاخۆ دەبێت لەچی ڕابمێنن!!

ئەگـەر مـرۆڤ مێشـکی بـۆ دۆزینـەوەی وەسـتای ئـەم دیمەنانـە بەکارنەهێنێت ئاخۆ دەبێت لەچی دا بەکاریبهێنێت؟ (م.دەمیرکان)

لەئاسماندا زۆر شتی پڕ پەندو ئامۆژگاری ڕوودەدات، بۆ ئەوانـە چـاوێك کـە ببینێـت، زمانێـك کـە گـۆ بکـات عـەقڵێك کـە بیربکاتـەوە پێویسـتە، مرۆڤەکان دەبێت هەم سوڵتانی گەردوون بناسن هەم بـزانن سـەفەرەکەیان بەرەو کوێیەو لەژێر فەرمانی کێدایە؟

مامۆستاکەمان نەیتوانی لەم بارەیەوە ڕەخنە بگرێت. هەرچـەندە هـیچ شتێکیشـی تیانەهێشـبووەوە تـا شـایەنی ڕەخنـە گـرتن بێـت، بـەڵام قوتابیەکان زۆر پێی کاریگەربوون، وەك ئەوەی مەسعود قسـەی نـەکردبوو بەڵکو هەنگوین لەدەمی هاتبووە دەرەوە، بابەتێکی لەوجۆرە نەدەکرا لـەو شێوەیە جوانتر باس بکرێت.

## ناتوانم باوەڕ بەزیندوو بوونەوەی مردووەکان بکەم:

مامۆستاکەمان پرسیارێکی تری کرد تا لەسەر بانگەشـەکەی بـەردەوام بێت.

-دەکرێ باس لە هەماهەنگی ڕووداوەکانی گەردوون بکرێت، دەشکرێت ئەمانە ببەستینەوە بەوەی کە لەلایەن بەدیهێنەرێکەوە دروستکراون، بەڵام زیندووکردنەوەی مردووەکان و لێپرسینەوەیان هیچ ڕێی تێناچێت.

کەواتـە دینـدارەکان پێویسـتە ڕوونکردنەوەیـەکی عاقڵانـە بـۆ ئـەم پرسیارە بخەنەڕوو.

مەسعود بەهێمنی و بەو ڕستانەی کە بەوردییەوە هەڵیدەبژاردن وتی:

-مامۆستا ئێوە زانایەکن کە لەبواری پـەروەردەی زانسـتدا دکتۆراتـان هێناوە. هەروەها فێرکارێکن کە لە بایلۆجی و زانستە سـەرەکییەکانی وەك

(توێکاری)تان خوێندووەو زۆرێك لە وردەکاریـەکانیان دەزانـن. منـیش زۆر تامەزۆربووم لەم بوارەدا شـارەزایی پەیـدا بکـەم. بۆیـە لەمـەودای توانـای خۆمدا بەدواداچوونێکم کرد.

بەواتایەکی تر بـەدوادا چـوونم بـۆ سـەرەتای دروسـتبوونی مـرۆڤ کـرد، دەمەوێت بۆتان باس بکەم، هەرکەمو کورتیـەکم هـەبوو تکایـە بـۆم ڕاسـت بکـــەرەوە، چـــونکە بـــۆ زانســـتی دروســـتبوونەوەی دووەم پێویســـتە دروستبوونی یەکەم بزانین.

مرۆڤەکان هەروەك چۆن هاتنیان بۆ ئەم دونیایە بەدەستی خۆیـان نیـە بەو جۆرەش ڕۆیشتنیان لەم دونیایە بەدەستی خۆیان نییە.

ئەو خاوەن دەسەڵاتەی کە مرۆڤـی بـۆ دونیـا نـاردووە، بـۆ ئامـانجێکی ناردووە، بردنەوەشی لەدونیا هەر لەبەر ئامانجێکە.

بەیەکـــەم نـــاردنی مـــرۆڤ بـــۆ دونیـــا دەوترێـــت دروســـتبونی یەکـــەمو بەزیندووبوونـــەوەی دوای مـــردنیش دەوترێـــت دروســـت بـــوونی دووەم، مرۆڤەکان بەگشتی لەجیاتی ئەوەی بیر لە دروستبوونی یەکـەم بکەنـەوە، پرسیار دەربارەی دروستبوونی دووەم دەکەن و، دەیانەوێت بزانن لـەدوای مردن "دووبارە زیندووبوونەوە چۆن دەبێت".

بـۆ تێگەیشـتن لەدروسـتبوونی دووەم کـە چـەندە ئاسـانو مـەنتیقیو پێویستە، دەبێت لەپێشدا دیقەت لە "دروستبوونی یەکەم بدەین".

دروست بوونی یەکەم چۆن ڕوودەدات؟

کاتێك لە لاشـەی سەرسوڕهێنەری مـرۆڤ دەڕوانـین، تێدەگـەین کـە بـۆ لەناوچوونو نەمان لەم دونیایەدا دروسـت نـەکراوە، بـەڵکو بـۆ ئامـانجێکی گرنگتر ئامادەکراوە.

چونکە خواست و مەبەستەکانی لەوە گەورەترن کە لەم دونیایەدا جێیان ببێتەوە.

جا بۆ ئەوەی لە گرنگی دروستبوونی یەکەم و زیندووبوونەوەی دوای مردنیش تێبگەین، پێویستە لەسەرچاوەی چۆنیەتی دروستبوونی کۆرپەلەی مرۆڤ بکۆڵینەوە.

هەڵبەت یەکەم قۆناغی بەدیهێنانی کۆرپەلە لە هێلکە خانەیەکی ناو پێکهاتویەکی مێینەوە دەست پێ دەکات کە پێی دەوترێ (هێلکەدان)، (هێلکۆکە) گەشتێکی دووروودرێژی لەبەردەمدایە، یەکەمجار دەچێتە ناو جۆگەی هێلکە پاشان ڕێگەیەکی دووروودرێژ دەبڕێت تا دەگاتە ناو منداڵدانی دایك.

لەناو جۆگەی هێلکەدا ملیارەها خانە دابینکراوە بۆ گواستنەوەی هێلکۆکە بۆ ناو منداڵدان ئەم هێلکە خانەیەش تەمەنی لە ٢٤ سەعات تێناپەڕێ، ئەگەر لەو کاتەدا نەپیتێنرێت دەمرێت، بۆیە پێویستی بە مادەیەکی زیندوو هەیە بۆ ئەم مەبەستە ئەویش ئەو تۆوەیە کە لە لەشی پیاوەوە دێت.

تۆو کاری گواستنەوەی زانیاری بۆماوەیی پێ سپێردراوە بۆ ناو خانەی هێلکۆکە لە مێینەدا، لەناو تۆودا ٢٣ کرۆمۆسۆمی بۆماوەیی نێرینە هەیە. سەرجەم زانیاریەکانی لەشی مرۆڤ بە وردەکارییەکانیەوە لەناو ئەو کرۆمۆسۆمانەدا تۆمارکراوە، بۆ دروستبوونی مرۆڤێکی نوێ پێویستە ئەم ٢٣ کرۆمۆسۆمەی ناو تۆوی پیاو یەکبگرن لەگەڵ ٢٣ کرۆمۆسۆمەکەی ناو هێلکۆکەی ئافرەت.

بەم شێوەیە یەکەمین بەشی لەشی مرۆڤ پێکدەهێنرێت کە لە (٤٦) کرۆمۆسۆمی بۆماوەیی پێکدێت.

تـۆو پێکهاتەیـەکی زۆر سەرسـوڕهێنەری هەیـەو زۆر بـەخێرایی بـەرەو هێلکۆکـە دەڕوات و، زۆر بـە وردی ئـەو زانیارییانـەی لەباوکـەوە هـاتووە دەگوێزێتەوە بۆ شوێنێك کە پاشماوەیەك ژیانێکی نوێی پیێ دەبەخشرێ.

بێگومان ناگونجێت کە هەموو بەشەکانی ئەو دەزگایەو ئەو ڕووداوانـەی پێویستە ڕووبدەن و ئەو کـارە گرنگانـەی پێویسـتە تـۆو ئـەنجامیان بـدات ڕێکەوت بن. هەروەها ناشگونجێ زانیارییەکان لەڕێگەی دووبارەکردنەوەوە پەیدابن، ئەمەش بەڵگەیەکی ڕوونە لەسـەر ئـەوەی کـە خـوای گـەورە ئـەم زانیاریانەی پیێ بەخشیوەو فێری چۆنیەتی بـەکارهێنانی زانیارییەکانیشـی کردووە.

دوای ئـەوەی کـە تـۆو دەگاتــە منداڵـدانی مێینـە، هێلکۆکـە بـەهۆی دەردانی ماددەی کیمیاییـەوە تـۆو بـەرەو لای خـۆی ڕادەکێشـێ، بەمـەش پەیوەندی لەنێوان تۆو و هێلکۆکەدا دروست دەبێ. هەموو ئەو ڕووداوانەش بەڵگەی ڕوون و ئاشکران لەسەر بەدیهێنانی مرۆڤ لەلایەن خوای گەورەوە.

دوای ئەوەی تۆو لەگەڵ هێلکەیەك یەك دەگرێ هێلکـەی پیتێنـراو پێـك دێت کە تیایدا زانیاری بۆماوەیی هەردووکیان لەنزیك یەکەوەن، بەڵام پاش ماوەیەکی کەم تێکهەڵکێش دەکرێن بۆ دروستکردنی مرۆڤێکی نوێ، هەموو زانیاریـەکان سـەبارەت بـە مرۆڤەکـە لـەو خانەیـەدان، زانیـاری سـەبارەت بەچـاوی، پێسـتی، ڕەنگـی قـژی و شـێوەی دەرەوەی و، هـەموو سـیفەتە فیزیاییەکانی مرۆڤیش لێرەدا هەڵگیراوە، هـەموو تایبەتمەندییـەکانی مـرۆڤ لەم خانەیەدا نووسراون.

پـاش پیتانـدن بۆماوەیـەکی کـەم خانـە تازەکـە دابـەش دەبـێ و (٢) خانەی نوێی تر دروست دەکات، ئـەم (٢) خانەیـەش دابـەش دەبنـەوە بـۆ (٤) خانـە. لـەکاتی دابەشـبوون و زۆربـوونی خانـەکان لـەناو هێلکـەی

پیتێنراودا ڕووداوێکی ناوازەی تر ڕوودەدات و خانەکان دەست دەکەن بە جیابوونەوە لە یەکتر، لەئەنجامدا کۆمەڵێ خانەی نوێ پەیدا دەبن کە ئەویش قۆناغی یەکەمی دروستبوونی لەشی مرۆڤە. هاوکات خانەکانی وێلاش کۆدەبنەوە کە دەبنە سەرچاوەی گواستنەوەی خۆراك بۆ منداڵەکە.

دوای (٤) ڕۆژ هێلکەی پیتێنراو دەگاتە منداڵدان و بەهۆی دەردانی ئەنزیمی تایبەتەوە خۆیان دەلکێنن بەدیواری منداڵدانەوەو دوای جێگیربوون گەشە دەکات و پێی دەوترێت کۆرپەلە.

پاشان هەریەکە لەخانەکان دەست دەکەن بە تایبەتمەندبوون و پێکهێنانی ئەندامەکانی لەش، خانە لێکچووەکان بەهۆی بۆماوە مادەی (DNA)ەوە هەریەکەیان ئەندامێك پێکدەهێنن.

وێلاش لە هەموو لایەکەوە دەوری کۆرپەلە دەدات و پێداویستیەکانی بۆ دابین دەکات. ئەو خانانەی کە وێلاشیان پێکهێناوە لەنێوان چەندەها خانەی لەشدا دەزانن کە کۆرپەلە پێویستی بە چ جۆرە خۆراکێ هەیەو پێی دەگەیەنن.

هەروەها پارێزگاری لە کۆرپەلە دەکەن لە هەر جۆرە هێرشێك، هەروەها خانەکانی دیوی دەرەوەی دیوارێك دروست دەکەن لەنێوان خوێنی دایك و کۆرپەلەدا، لەکاتی ڕێگەدان بە پێداڕۆشتنی خۆراکدا، ڕێگە دەگرن لە پێداڕۆشتنی خانە بەرگریەکان تاکو کاردانەوەی خراپ لەسەر کۆرپەلە دروست نەکەن.

ئەم پێکهاتەیەش جارێکی تر تەواوکاری دروستکاری خوای باڵادەست پیشان دەدات.

بەدرێژایی تێپەڕبوونی چەند مانگێك كۆرپەلە لە سكی دایكیدا گەشە دەكات، تا دەگاتە ئاستێك كە ئامادەیە لە قۆناغی لەدایك بووندا ڕووبەڕووی جیهانی دەرەوە ببێتەوە.

كاتێك منداڵ لەناو ئەم سیستمەدا پەیدادەبێتو دەست بەژیان دەكات، یەكەم موعجیزەی گەورە بریتییە لەو پەیوەندییەی كەلەگەڵ دایكەكەدا هەیەتی.

بیر لەدایكێك بكەنەوە كە دژەمیكرۆب لەنێو شیرەكەیدایە بەبێ ئەوەی خۆی تێی كردبێت، منداڵێك ئەگەر توشی سورێژە نەبوبێت لەومادەیەدا كە شیری دایكەكە دەخوات توشی نابێت، ئەمە چ سیستمێكی ناوازەیە كە بۆ پاراستنی منداڵەكە دژە میكرۆبی پێویستی بەئۆتۆماتیكی لەشیری دایكەكەوە پێ دەكات.

لەهەموو ئەوانە سەرنج ڕاكێشتر، پێكهاتەی شیری دایكە، پێكهاتەی شیری دایك هەموو ماددەیەكی خۆراكی پێویستی تێدایە، ئەگەر دایكەكە بەهێزبێت یان لاواز پێویستە لەسەری كە هەموو ئەو ماددە خۆراكیانە دابین بكات كە منداڵەكە پێویستیەتی، چونكە ئەو سیستمە ژمێریاریەی كە لە ڕژێنەكانی مەمكی دایكەكەدا جێگیركراوە بریتییە لەكاریگەری كیمیایی كە هەموو ماددە پێویستبەكان بۆ منداڵ بەرهەم دەهێنێت.

بۆ نموونە: بیر لەڕژێنی زراو بكەینەوە، ئەگەر ئەم ڕژێنە كار نەكات ئەوا جەستە ناتوانێت خواردن هەرس بكات، هەروەها هەموو خانەكان دەمرن تەنانەت خانەكان دەردانی زراویش، بەڵام ئەم حاڵەتە لەخانەكانی ڕژێنەكانی مەمكدا بەرچاو ناكەوێت، سیستمێكی ئیلاهی فەرمانی پێداون "پێویستە ئەمانە بكەیت".

هەروەها ئەو دایکەی کە لەپرۆتینەوە تا هەموو کانزاکان دەگوازێتەوە بۆ منداڵەکە لەکاتی دروستبوونیدا هەمان سیستم پەیوەندی نێوان منداڵەکەو دایکەکە دابین دەکات، ئەم پەیوەندییە ڕووداوێکی زۆر هەستیارە کە لەئەنجامی توێژینەوە زانستیەکاندا دەرکەوتووە. (دکتۆر هالوك نوریاکی).

کەواتە ئەو زاتەی کە دروستبوونی یەکەمی بەو دیزاینە بێ کەمو کورتییە خولقاندووەو کە مرۆڤەکانی تووشی سەرسوڕمان کردووەو بەحیکمەتەوە دروستی کردوون، ئایا ناتوانێت مرۆڤێکی مردوو دووبارە زیندووبکاتەوە؟ خوای گەورە کاتێك لەیەکەم جاردا مرۆڤی ئەوەندە بێ کەمو کورتی خولقاندبێت بۆ لێپرسینەوەیەك دەتوانێت زۆر بەئاسانی زیندووی بکاتەوەو، بیخاتە بەردەم مەحکەمەیەکی گەورە، مادام پەیمانی دابێت هەر دەیباتە سەر.

پرسیارەکانی مامۆستاو وەڵامەکانی مەسعود بەتەواوی ٣ سەعاتی خایاند خوێندکارەکانی پۆلەکە بێ ئەوەی دەنگیان لێبێت گوێیان بۆ وەڵامەکان دەگرت، جەوێکی زۆر خۆش ڕەخسا بوو لەکاتی موناقەشەکەدا.

مامۆستاکەمان هاتە لای مەسعود و پێی وت:

–دەستت بێنە بابی گوشم، بۆ من شانازییە کە مامۆستای قوتابیەکی وەك تۆم.

مەسعود لەبەرامبەر ئەم هەڵسوکەوتە کاریگەرەی مامۆستادا هەوڵی دا دەستی مامۆستا ماچ بکات، وتی:

–أستغفر الله مامۆستا، لەڕاستیدا بۆ من شانازییە کە مامۆستایەکی وەك تۆم هەبێت، بەسنگ فراوانیەوە گوێتان بۆ گرتم، ئەمە گەورەییەکە کە شایەنی ڕێزگرتنە، چونکە بەداخەوە ئەم هەستی بەرپرسیارێتییە

هەستیارییە لە هەموو مامۆستایەکدا بەدی ناکرێت بەم هەڵسوکەوتەتان جیاوازی خۆتانتان خستەڕوو، هەروەها مەردی خۆتان نیشاندا.

سەیرم کرد چاوەکانی مامۆستا پڕ فرمێسک بوونو دەمو چاوی شێوەیەکی عاتفی وەرگرتبوو.

بەڕاستی ئەمە نزیك بوونەوەیەکی جوان بوو، ئەمە ڕێگەیەك بوو بۆ نزیك بوونەوەی لە بێ باوەڕترین کەس.

هەستی سەرسوڕمان بەرامبەر بە مەسعود تەنها لەدەمارەکانی مندا نەدەجولا بەڵکو هاوڕێیانێکی زۆر بەچاوی غیرەوە لێیان دەڕوانی، بەڕاستی مەسعود بەتوانا بوو.

مامۆستاکەمان لەکۆتاییدا پرسیاری کرد کە ئایا ئەم شتانە لەکوێوە فێردەبیتو لەکام کتێب سوود وەردەگریت؟

—من هەوڵی خوێندنەوەی لایەنەکانی حیکمەتی (زانست) دەدەم، من بۆئەوە دەخوێنمەوە کە لە بابەتە سەرنج ڕاکێشو نهێنیەکان تێبگەم، ئەو کتێبانەی کە لەم بوارەدا ڕێنیشاندەرن "پەیامەکانی نوور"ن.

—کتێبەکانی مامۆستا سەعیدی نوورسی دەڵێیت وانییە!

—بەڵێ.

—کەواتە ئەم کتێبانە بابەتی لەو جۆرە خۆشی تیایە ها؟

مامۆستاکەمان سەری داخستو ماوەیەك وامایەوە پاشان سەری بەلای ڕاستو چەپدا جوڵاندو لەبەرخۆیەوە دەیوت:

—هەڵەیە... زۆر هەڵەیە... ئێمە زۆر بەهەڵە لەپەیامەکانی نوور و سەعید نوورسی تێگەشتبووین، مانای وایە چەواشەیان کردووین و زۆر بەهەڵە باسی ئەم کتێبانەیان بۆ کردووین.

وانەی ئەو ڕۆژەمان زۆر خۆش تێپەڕی، بەجۆرێك مێشكێك نەمابویەوە کە سوودی وەرنەگرتبێت، دڵێك نەمابوو کە کاریگەری لەسەر نەبوبێت، هەروەها چاوێك نەمابوو کە پڕفرمێسك نەبوبێت.

# بەشی نۆیەم

## شەوو ڕۆژ بەخەیاڵی ئەوەوە دەنوستمو هەڵدەستام

**پوختەی ئەم بەشە**

"خۆشەویستی ڕاستەقینە، عەشقی هەمیشەیی کە لەبەرئەو مردنیش لەبەرچاو دەگریت" دەبوو هەرئەمە بێت. ئەگەر نەگەیشتمایە بە مەسعود ژیانی من کۆتایی دەهات. من عەشقی ئەخلاق و کەسایەتی ئەو بووم.

## ئارامیم لێ بڕابوو، جۆش و خرۆشم لەلوتکەدابوو

هەموو ئەو هاوینەم بەخەیاڵی مەسعودەوە بەسەربرد، تەنانەت بۆ ساتێکیش بێت لەبیرم نەدەچوو، بەبێ ئارامیەوە چاوەڕوانی کرانەوەی زانکۆم دەکرد.

چەندجارێك بەبیانوی هیچ و پوچەوە تەلەفونم بۆ مەسعود کرد، تەنها دەمویست گوێم لەدەنگی بێت، ئەویش بەدڵنیاییەوە ئەمەی دەزانی.

لەو ماوەیەدا داخوازییەکانم هەربەردەوام بوون، دەوڵەمەندەکان، دکتۆرەکان، حاکمەکان، یاریدەدەرەکان.. کارمەندەکانی پەروەردە.. جا بڵێ کێ لەلیستەکەدا نەبوو...!

بەڵام هەموو ئەمانە بۆ من بێ بایەخ بوون، بڕیارمدابوو یان لەگەڵ مەسعود هاوسەرگیری بکەم یاخود تاکۆتایی تەمەن بەکچێتی بمێنمەوە، بڕیارەکەم بڕیاری کۆتایی بوو.

عەشقی مەسعود ئەوەندە کاری تێ کردبووم و، ئەوەندە گڕی تێ بەردابووم کە هیچ شەوێك تێ پەڕ نەدەبوو بێ ئەوەی خەونی پێوە نەبینم.

تەنانەت جارێکیان لەخەونمدا دایکم بینی، باسی مەسعودم بۆ ئەویش کرد لەدەم و چاویی دایکمدا زەردەخەنەیەکی شیرین دەرکەوت و وتی:

—خودا خێر دەخاتە هەموو شتێکەوە کچی خۆم، تۆ ئەو شتانەی کە دەتەوێن، لەبەر خودا بتەوێن.

مـن ئەمـەم لەلایەکـەوە وەك پەسـەندبونێك قبـوڵ کـرد، وەك ئومێـدێك لەڕێگەی ئەگەری گەیشتن بەمەسعود، لەدوای تێپـەڕبوونی هـەر ڕۆژێکـیش بۆم دەردەکەوت کە ئەو لایەنەی مەسعودی بەلای مندا ڕاکێشابوو:

بەڕێزیو جوانیو ڕواڵەتی دەرەوەی نەبوو بەڵکو من حەیرانی ڕەوشـتی بەرزو کەسایەتی سەنگین و جوامێرانەی ئەو بووم.

دەست پێکردنەوەی دەوامی زانکۆ جەژنی من بوو، بۆ بینینی مەسـعود ئارامیم لێ هەڵگیرابوو، جۆشو خرۆشم لە لوتکەدابوو.

کاتێـك گەیشـتمە دەرگـای پۆلەکـە قاچـەکانم گوێـان نـەدەکردو کۆتـا خۆڕاگریشم لەدەستدا.

خوایە گیان، دڵی مرۆڤ چۆن دەتوانێت بەرگـەی گـەردەلولێکی وابـەهێز بگرێت؟! ئـەو دڵـە چـۆن بەرگـەی ئـاگرێکی وا سـوتێنەر دەگرێـت؟! دڵو مێشك چۆن دەتوانێت لەژێر ئەو پەستانەدا خۆ ڕاگرێت؟

لەبەردەمی دەرگاکەدا کاتێك چاوەکانم بەدوای مەسعوددا دەگـەڕان بـە زۆر خۆم ڕاگرتبوو، ئەوەندە مێشکم مەشغوڵ بوو تەنانەت گوێم لەسـەلامی ئەوانەش نەبوو کە بەلای ڕاستو چەپمدا تێدەپەڕین.

## هەوڵم دەدا قسەی لەگەڵدا بکەم:

کاتێك ئەوم لەدوورەوە بینی ئاگر لەناخم بەربوو، خەریك بـوو لەترسـی ئەوەی بەلامدا بڕوات و سەلامم لێ نەکات زراوم دەچوو، ئەگەر ئـەم هاوینـە منـی لەبیرچـوبێتەوە یـاخود کەسـێکی تـر چـوبێتە ژیانیـەوە مـن چـیم بکردایە؟! تەنانەت بیرکردنەوەش لەمە دەی ترساندم.

ڕێـك بەلامـدا تێپـەڕی، چـاوم هـەر لەسـەری بـوو، نیـوە سـەیرکردنێك سەیری کردمو سەری بەهێواشی لەقاند.

ئای خوایەگیان تەنانەت ئەوەش بەس بوو، ئەو سەلامە بچوکەش ئەگەر چی کەمیش بێت، کەمێك لەئاگری ناخمی کوژاندەوە.

یەکسەر چووم بۆلای‌و وتم:

—سڵاو مەسعود! وەك ئەوی سڵاوێکی ئاسایی بکەم.

نیوە سەرنجێکی دام‌و وەك بڵێت "سڵاو" سەری لەقاند.

بۆئەوەی قسەی لەگەڵدا بکەم ئەم پرسیارەم کرد:

— کەی وانەکان هەڵدەبژێردرێن! هەواڵت هەیە؟

وەك ئەوەی بڵێ "نا" سەری لەقاند.

—تۆ بەتەمایت کامیان هەڵبژێریت؟

—نازانم، هێشتا بڕیارم نەداوە.

—من دەروازەی کۆمەڵناسی هەڵدەبژێرم.

—ڕەنگە منیش ئەوە هەڵبژێرم.

—بێ ئەوەی لەدەستمدا بێت هاوارمکرد:

—بەڕاستە؟

وام لێکدایەوە کەوەك بڵێی منی خۆشدەوێت‌و لەبەر ئەوەی منی دەوێت ئەو وانەیە هەڵدەبژێرێت، بەڵام هاوارەکەم نیەتەکەمی دەرخست.

بینیم دەم‌و چاوی مەسعود سوور هەڵگەڕاو، سەری داخست، بۆیە ناچار بووم جێی بهێڵم تا لەوە زیاتر تەریقی نەکەمەوە.

## ئەمە وا نەدەڕۆی... پێویست بوو قسەی لەگەڵ بکەم؛

(سەلمانور) ناوی ئەو کچەبوو کە لەژوورەکەدا لەگەڵمدابوو، کە بەڕاستی وەك نوور پاك بوو، ئەونیشانە کرابوو.

هەستم بەرامبەر بەمەسعود بۆ سەلمانور باسکردو داوام لێکرد کە یارمەتیم بدات.

دەمویست لەکاتێکدا قسە لەگەڵ مەسعوددا دەکەم لەگەڵم بێت و یارمەتیم بدات، ڕێکەوتین..

لەدوای چوونەدەرەوە لەپۆل لەکاتی پشووی نیوەڕۆدا مەسعودم وەستاند و وتم:

—مەسعود، دەمەوێت بابەتێکی گرنگت لا باس بکەم، لەگەڵ (سەلمانور)دا دەتوانیت مەجالێك دروست بکەیت:

دڵم ئەوەندە بەخێرایی لێی دەدا کە زۆر بەقورسی ئەو قسانەم لەدەم هاتنە دەرەوە. مەسعود کەمێك بیری کردەوە پرسی:

—سەبارەت بەچی قسە دەکەین؟

سەیری چاویم کردو وتم:

—بابەتێکی گرنگ.

ئەو تێگەیشت و وتی:

—من هێشتا ئامادەنیم بۆ بابەتی گرنگو ناشمەوێت بێ تاقەتت بکەم.

لەترسا لەرزێك کەوتە دڵمەوە.

—بۆچی؟ مەگەر کەسێکت نیشانە کردووە؟ یاخود دەستگیرانداری؟

—نەخێر، هێشتا بیرم لەو بابەتە نەکردوەتەوە.

ئۆخەیش، ئیسراحەتم کرد، چونکە تەنها ترسێکم لەوەبوو، بۆیە وتم:

—بەقسەکردن هیچ ڕوونادات، ئەگەر چایەکم لەگەڵ بخۆیتەوە ئەوا دڵخۆشم دەکەیت.

وابزانم ئەم ڕستەیەی کۆتاییم بەپاڕانەوەوە دەربڕی، ئەوەندە کاریگەربووبووم یەکسەر چاوم پڕبوو لە فرمێسك.

کاتێك سەیری کردم زەردەخەنەیەکی کرد، چونکە تێگەیشتبوو کە من لەچ ویستو ئارەزوویەکی گەورەدام، وتی:

–باشە، تەنها لەبەر چایەکە قبوڵی دەکەم.

ئای خوایەگیان! دەتوت هەموو دونیایان داوەتێ من ئەمەم وەك مـوژدەی "باشە لەگەڵتـدا هاوسـەرگیری دەکـەم" وەرگـرت، خـەریك بـوو لەخۆشیدا دەفڕیم.

## خەریك بوو دەبوورامەوە:

لەکۆتاییدا خەونەکانم هاتنە دی، ئاواتەکانم بەشوێنی خۆیان گەیشتن، نزیکەی دووساڵە لەبەر ئاگری ئەم عیشقەی کە خەریکە ناخم دەسوتێنێت، ئەگەر پێویست بکات تکای لێ دەکەم و لێی دەپاڕێمەوە.

مـن و مەسـعودو سـەلمانور لەشـوێنێکی پـەنهانی کافتریـادا پێکـەوە دانیشتین، ناتوانم باسی هەڵچوون و شـڵەژانو ترپـەترپی دڵـم لـەو کاتـەدا بکەم، دەست و قاچەکانم دەلەزرین، خەریکبوو لەخۆشیدا دەفڕیم.

بەهەموو توانامەوە هەوڵم دەدا خۆم ئارام بکەمەوە، بەڵام نەمـدەتوانی مەسعود کاتێك بینی پیاڵە چایەکە لەدەستمدا دەلەزرێ، زەردەخەنەیـەکی شیرین لەدەمو چاوی دەرکەوت، هەسـتکردنی ئـەو بـەمن زیـاتر ورەی پـێ بەخشیمو کەمێك هێوربوومەوە.

سـەلمانور سـەیرێکی کـردمو بەچـاو ئامـاژەی بـۆ کـردم "یـەڵا دەسـت پێبکە"

بەڵام من نەمدەتوانی بە ئاسانی بڕۆمە ناو بابەتەکەوەو ئەو شتانەی کە دەمـەوێت بیـانڵێم، لەناخـەوەوە هـەزارجار دوعـام کـرد ئینجـا دەسـتم بەقسەکردن کرد.

–مەسـعود، لەڕاسـتیدا هۆکـاری داواکردنـی ئـەم دیـدارە تـەنها چاخواردنەوە نەبوو. ویستمان بابەتێکی گرنگت لەگەڵدا باس بکەین.

من ئەوەندە خۆم شڵەژاندبوو خەریك بوو خـۆم پارچـە پارچـە دەکـرد، کەچی مەسعود بەپێچەوانەوە زۆر خوێن ساردو ئیسراحەت بـوو چـاوەڕێم کرد بڵێت "ئەم بابەتە گرنگە چییە؟" بەڵام نەی پرسی.

## لەکۆتاییدا باسمکرد:

–ئەو بابەتە گرنگەش کە ئاماژەم پێدا ئەمەبوو: وابەرەو تـەواو کردنـی زانکـۆ دەڕۆیـن، هـەم ژیـانی ئـیش‌و هـەم ژیـانی هاوسـەرگیری چـاوەڕێمان دەکـات، شـتێکی سروشتیشـە کـە هـەموان کەسـێك هەڵدەبـژێرن کـە لەگەڵیاندا بگونجێت‌و بەگونجاوی بزانن بۆئەوەی ژیانی لەگەڵدا ببەنەسـەر، لەبەر ئەمەش هەر یەکێك دڵی بەکەسێك دەکرێتەوە.

لەو ڕۆژەوەی کە ئێوەم ناسیوە، ئـەو کەسـەی کـە ژیـان‌و خەونـەکانی منی ڕازاندۆتەوە ئێوەن، ئەمە هەرگیز یارییەکی گەنجانـەو حـەزێکی کـاتی نیـە، ئەمـە بـۆ مـن گـرنگترین بابـەتی ژیانمـە، بەشـێوەیەکە کـە نزیکـەی دووساڵە بەخـەیاڵی ئێـوەوە دەخـەوم بەخـەیاڵی ئێـوەوە هەڵدەسـم، چـی بکـەم بەدەسـت خـۆم نیـە، تکایـە وەك کچـێکی سـادە لـێم مـەڕوانن، هەستەکانم بەرامبەر بەتۆ کۆمەڵە هەستێکی زۆر پیرۆزن.

مەسعود کاتێك بینی بەهەزار ناڕەحـەتی‌و هەیـەجان‌و ئـارەق کردنـەوە قسەم دەکرد هەڵی دایەو وتی:

–ئەوەندە خۆت ماندوو مەکە جانان، من ئاگـاداری ئـەوە هـەم کـە تـۆ جدیت لەبابەتەکەدا، ئەمـە شـتێکیش نیـە بڵـێم ئـەمڕۆ زانیومـە، مـن ئـەوە لەیەکـەم ڕۆژی ناسـینەوە دەزانم، جیـا لـەوەش نـەك تـەنها هەسـتەکانت بەرامبەرم بەڵکو لەبیرکردنەوەو تێڕوانین‌و ڕابردووشت ئاگادارم.

ئێوە هەم کچێکی جوانو هەم دیاریشن زۆریش زیرەکن، بەڵام ئەم هاوسەرگیرییە قورسایی زۆری دەبێت.

بەو قسەیە ڕووخام، پێم وابوو لەدوای ئەو هەموو پیاهەڵدانە قسەکانم بە"داواکاریەکەت قبووڵ دەکەم" کۆتایی دەهێنێت.

بەترسو هەڵچوونەوە وتم:

—لەبەرچی؟

—من و تۆ دوو دونیای جیاوازمان هەیە، تۆ شێوازی تێڕوانینت لەژیان، چاوەڕوانیەکانت لەژیان، داواکاریەکانت زۆر جیاوازییان هەیە، ئەگەر منو تۆ پێکەوە بژین، بۆ تۆ ناخۆش دەبێت، من ناتوانم بەم حاڵەمەوە تۆ بەختەوەر بکەم، ئەوکاتە تۆ زۆر دڵگران دەبیت.

نەمتوانی لەوە زیاتر بەرگەی ڕوونکردنەوەکانی مەسعود بگرم، بۆیە دەستم کرد بەپاڕانەوە.

—من بەهەموو شتێك ڕازیم، لەکۆنترۆڵکردنی خۆمەوە تا هەموو داواکاریەکانت ملکەچی دەکەم، هەموو داواکارییەکانت جێبەجێ دەکەم، تۆ تەنها من قبوڵ بکە.

## مەسعود بەردەوام بوو لەپێداگرتن:

—ئەمە ئەوەندە ئاسان نییە خاتوو جانان، پێکەوە دونیایەك دروست دەکەین، من ناتوانم ڕێ بەوەبدەم کە تۆ لەژێر داواکارییەکانی مندا بچەوسێیتەوە. داواکارییەکانی تۆش بۆ من پێچەوانەیە، لەبەر ئەوەش ئەم هاوسەرگیرییە ناڕوات بەڕێوە.

تۆ کچێکی زۆر جوانیت دەتەوێت بەشێوازی دڵی خۆت بژیت تۆ شایەنی کەسانێکی باشترو دەوڵەمەندترو بەناوبانگتریت.

تۆخۆ دەبینیت من کوڕێکم بەدینەکەمەوە پەیوەستم، تۆش حەز لەگەڕان و سەفاو ڕابواردن و کات بەسەربردن دەکەیت، چۆن دەکرێت ئەم دوو دونیا جیاوازە پێکەوە بگونجێت؟

—من لاپەڕەیەکی نوێم لەژیانم هەڵداوەتەوە، من چیتر ئەو جانانە نیم کە دەتناسی، ئێستا ئەو جانانەی کە لەبەرامبەر تۆدا دانیشتووە ئامادەیە بەزەوق و حەسرەت و عیشقەوە لەدونیاکەی تۆدا بژی، ئامادەم وەك کۆیلەیك هەموو داواکاریەکانت جێبەجێ بکەم، فەلسەفەو بیرو ڕاکانیشت بۆ من پیرۆزن، تکات لێدەکەم بەم شێوەیە قبوڵم بکە.

—ئەوشتانەی کە ئێستا دەیانڵێیت، کۆمەڵە وشەیەکن کە بەهۆی هەست و سۆزەوەیە کاتێك خەونی ئەم هاوسەرگیریە تەواو دەبێت و ژیانی ڕاستەقینە دەست پێ دەکات هیچ کام لەمانە بونیان نامێنێت. خۆت ماندوو مەکە ئەم ئیشە سەرناگرێت.

## من دەگریام:

وام هەست کرد ئەو ڕستەیەی کۆتایی، کۆتا ساتی تەمەنم بوو، شتەکانی دەوروبەرم دەسوڕانەوە. خەریك بوو خۆمم لەدونیای خۆمدا ون دەکرد. لەکۆتاییدا دیتم کۆتا چانس تاقی بکەمەوە لەبەر ئەوە دەستم کرد بەگریان.

—سوێند دەخۆم ئەوانەی دەیڵێم هەموویم بەڕاست بوو، ئەگەر لەگەڵ تۆ هاوسەرگیری نەکەم ئەمە کۆتایی ژیانم دەبێت، دەمەوێت ئەمە بزانیت، تکادەکەم مەڵێ"نا" کەمێك بیربکەرەوە، من ناتوانم بەرگەی ئەمەبگرم.

مەسعود کەمێك بێدەنگ بوو بۆ ماوەیەك کەوتە بیرکردنەوەیەکی زۆر قووڵەوە، وادیاربوو حاڵی کچێك کە لەبەرامبەریدا دەتلایەوە کاری تێ کردبوو بۆیە وتی:

–باشە، باوەك ئەوەبێت کە تۆ دەخوازیت، مادام ئەم بابەتە پەیوەندی بەمەسەلەی ژیانی تۆوە هەیە باپێکەوە ئەم کێشەیە چارەسەر بکەین.

ئای خوایە گیان، ئەمە چ موژدەیەکی خۆشبوو، ئەو خۆشیە وەك خۆشی مەحکومێکی پەتی سێدارە وابوو کە حوکمی لێخۆشبونی بۆ دەرچووبێت. وەخت بوو بکەوم بەسەردەست و قاچی دا و ماچی بکەم.

مەسعود هەنگاوێکی تری ناو وتی:

–باشە ئیتر جانان، وەرەوە سەرخۆت، ئەو فرمێسکانەشت بسڕە هەمووان سەیری ئێمە دەکەن، مادام تۆ ئەوەندە منت خۆش دەوێت، بۆ منیش کچێکیت کە شایەنی خۆشویستنیت.

خەریك بوو لەخۆشیا دەفڕیم، ئەمە بوو موژدەی ڕاستەقینە، ئەی ئێستا چی بکەم؟ حەزم دەکرد ئەم خۆشیە لەگەڵ هەموو کەس، هەموو دونیا دابەش بکەم.

ئەو ڕۆژە ڕۆژێکی تایبەتی ژیانی من بوو، ئەگەر ئەم پەندە لەشوێنی خۆیدا بێت ئەوا من لەمردن گەڕابومەوەو دووبارە زیندوو بووبوومەوە.

## خەونەکانم هاتنەدی:

مەسعود نیشانەی کردم، ئەوە گەورەترین خۆشحاڵی و دڵخۆشی و دەوڵەمەندی من بوو، ئەو ڕۆژە هەموو دونیایان پێ بەخشیم، دەتوت ئەو ڕۆژە کردومیان بە پادشاو سوڵتانی دونیا. ئەو ڕۆژە کەس نەمابوو هاواری

خۆشـحاڵی مـن نەبیسـتێ، لـە ئەتۆمەکانـەوە تـا هەسـارەکان... هـەمووان بەشداربوون لەخۆشیەکانی جانانی بێ ئەواو بێکەسدا.

پەروەردگارم گەورەترین ئاوات و داواکاری منی قبوڵ کرد.

بـەڵام خێزانەکـەی مەسـعود بەمـە ڕازی نـەبوون، دەیانویسـت کچێکی خزمیان بۆ مەسعود داوا بکەن، ئەوەندە دژایەتی ئەم هاوسەرگیریەیان کرد کە وەخت بوو مەسعود لەمنداڵی خۆشیان بێ بەش بکـەن، بـەڵام مەسـعود وازی لەمن نەهێنا. بریارماندا پێکەوە ڕووبەڕووی نارەحەتییەکان ببینەوە.

چیتر منیش جانانی پێشوو نـەبووم. چوونە نـاو دونیاکـەی مەسـعودەوە، گوێگرتن لەڕاو بۆچوونەکانی ژیانێکی پڕچێژی بەمن بەخشیبوو.

لەبەرامبەر ژیانی پێشومدا داوای لێخۆشبونم کرد، من چیتر نەجگـەرەم دەکێشـاو نـەعارەقم دەخـواردەوە. نوێـژەکانم دەکـردو هـەوڵم دەدا ببمـە بەندەیەکی باش بۆ خوای گەورە، چونکە ئەو هەموو داواکارییـەکانمی پـێ بەخشـیبوم، ئێسـتاش نـۆرەی مـن بـوو کـە گوێڕایـەڵی فەرمانـەکانی ئـەو پەروەردگارە بەسۆزو بەخشندەیە بکەم و لەخۆمی ڕازی بکەم.

هــەردووکمان قیســـمەتمان بـــەرەو ویلایـــەتێك دەرچـــوو، لەهـــەمان شارۆچکەو لەهەمان قوتابخانـەدا دامـەزراین و لـەوێ ژیـانی هاوسـەرگریمان پێکەوەنا.

تەنها وشەیەکم نەدۆزییـەوە کـە وێنـای خۆشـحاڵییەکەمانی پـێ بکـەم، ڕێك بە مانای وشە ژیانێکی بەهەشت ئاسا دەژیاین.

لەگەڵ مەسعوددا هەموو ڕۆژێك جوزئێك قورئانمان دەخوێندەوە باسـی (پەیامــەکانی نـــوور)مــان دەکــردو لــە هــەوڵی پەیــداکردنی ڕەزامەنـدی پەروەردگاردا بووین، من لەگەڵ ژنەکانی دەوروبـەرم و مەسـعودیش لەگـەڵ

پیاوەکاندا باسی جوانیەکانی دینو ئیمان و بەندایەتی و خۆشبەختیمان دەکرد.

منیشو مەسعودیش زۆر بابەخمان بە قوتابییەکانمان دەدا، هەر قوتابیەك کە بەهۆی نەبوونیو ئازارو کێشە بهاتایەتە لامان، یاخود هەژار بوایە تا لەدەستمان بهاتایە یارمەتیمان دەدا، لەبەرئەوەی ژیانی مەسعودیش وەك من بەهەژاریو نەبونیدا تێ پەڕی بوو.

لەماڵە سادەکەماندا شنەبای خۆشبەختی هەڵی کردبوو و، هەردووکمان بە بەختەوەری دەژیاین.

بەتێپەڕبوونی کات ئەو عیشقەی کە بۆ مەسعود هەمبوو زیاتری دەکرد، من بەڕاستی لەم دونیایەدا لەگەڵ فریشتەیەکدا زەماوەندم کردبوو، پەروەردگارم ئەمەی وەك بەخشیشێك پێ بەخشیبووم.

سەرەڕای ئەوەی لەیەك قوتابخانەش بوین لەوانە ٤٠ دەقیقەییەکانیشدا بیرم دەکرد یەکسەر دوای زەنگی پشووی نێوان وانەکان بەرەو لای ئەو ڕام دەکرد. وامدەزانی کە ساڵەهای ساڵە نەمدیوە.

چاوەکانم جگە لە مەسعود کەسی تری نەدەدی لەو نێوەدا، وام دەزانی پیاوەکانی هەموو دونیا مردوونو بەس مەسعود دەژی، بۆ من لەژیانمدا تەنها ئەو هەبوو.

مەسعودو عەشقەکەی هەموو ڕۆژێك ناخمی بەگەرمییەکی شیرین گەرم دەکردەوەو خۆشەویستییەکەی ژیانی پێ دەبەخشیم.

خوای گەورە لەدوای ساڵێك کوڕێکی جوانی پێ بەخشین، سەرەڕای هەموو پێداگرییەکانی مەسعود ناوی منداڵەکەشمان نا مەسعود، تەنها ناوێکی تریشمان بۆ زیاد کرد (مەسعود سەعید).

وەك ئەوەی بزانێت دواتر چ بەڵایەکی بەسەردا دێت.

# بەشی دەیەم

## بەهەشتی ژیانم لەناکاو گۆڕا بۆ دۆزەخ

**پوختەی ئەم بەشە**

ئەوەی لە خەونەکانمدا دەمبینی و ئەو خۆشەویستییەی لە خەیاڵەکانمدا دروستم دەکردن، لەکۆتاییدا بوون بە ڕاستەقینە. لەوکاتەی سەرسام و خۆشحاڵ بووم بەو بەهەشتەی تیایدا دەژیام، بەڵایەك کە هیچ بەبیرمدا نەدەهات پێشی پێ گرتم. ئیتر من چۆن دەمتوانی بژیم؟ خودایە چی دەبێت، ئەم ئەمانەتەش ببەرەوە.

# تاقیکردنەوەیەکی سەخت

مەسعود سەعید مانگێکی تەواو کردبوو، منیش لەبەرئەوەی مۆڵەتی دایکایەتیم هەبوو لەماڵەوە بووم، مەسعودیش لەقوتابخانە.

ئەو ڕۆژە لەبەیانییەوە ئازارێکی سەیر لەناخمدا هەبوو، ئاگرێك کەنەمدەزانی ناوی لیّ بنێم چی؟ خەریك بوو گڕی لە ناخم بەردەدا.

هەموو ئەمانە لەخۆڕایی نەبوون..

لەوە زۆر جوان تێگەیشتبووم کە دونیا نابێتە بەهەشت، بەواتایەکی تر لەدونیادا بەهەشت بوونی نیە، لەکاتێکدا کە دەموت وا ئیسراحەتم کرد کێشەیەکی تر ڕووی تێ دەکردم.

بێگومان دونیا ماڵی تاقیکردنەوەیە، کاتێك دەڵێیت تاقیکردنەوەش بەردەوام بەندە ڕووبەڕووی بەربەست و، ناڕەحەتیو دەردو ئازار دەبێتەوە، بێگومان زۆربەی جاریش خۆشبەختی و، ناوبانگ و، دەوڵەمەندی و، جوانی دەبن بە گەورەترین هۆکاری تاقیکردنەوە.

ئێمەش بەندەبووین، تاقیکردنەوەی ئێمەش هێشتا تەواو نەبووبوو، ئەو عیشقە سیحراوییەمان، ئەو خۆشەویستییە پڕ چێژو خۆشیەمان زۆری نەخایاند.

لەگەڵ تاکە دڵنەواییو سەرچاوەی خۆشحاڵیو تاکە هاوڕێی ژیانمدا مەسعود سەعید ئەو ڕۆژە دووبارە ڕۆژێکی پڕ چێژمان بەسەر دەبرد،

بەهەستی دایکایەتی‌و سۆزەوە کاتی خۆشم لەگەڵدا بەسەردەبردو یاریم لەگەڵ دەکرد.

ئەوەندە خووم دابوویە ئەو خۆشەویستییە سیحراوییەی منداڵەکەم، درەنگ هەستم بەدەنگە دەنگەکەی دەرەوە کرد.

دەنگە دەنگی سەیارە، قیژەو هاوار..

لەبەر خۆمەوە وتم:

—تۆ بڵێی شەڕ بێت؟ چی بووبێت؟

بێ هەواڵ لەو بەڵایەی کە بەسەرمدا هاتووە، منداڵەکەم دووبارە خەواندەوەو چوومەدەرەوە.

بەردەمی ماڵەکەمان ڕێك وەك مەیدانێکی شەڕ وابوو، کۆمەڵێك خەڵکی زۆر حەوشەبچوکەکەیان پڕکردبوو، بەجۆرێك تێکەڵ بووبوون نەکەس گوێی لەکەس بوو نە لە هیچ دەنگێکیش بەجوانی تێدەگەیشتیت.

ئەمبولانسێك لەنزیك ئەوێ بوو، بینیم هاوڕێکانی مەسعودو هەندێك لە دراوسێکان‌و هەندێك لەناسیاوەکانی بەرەو لای ئەمبولانسەکە ڕایان دەکرد، بەڵام هەمووان لەناڵەو فەریادو ئەی هاواردابوون.

لەسەرەتادا هیچ شتێك تێ نەگەیشتم، بێ هەواڵ لەو کارەساتەی کە بڕیارە هەموو ژیانم تاریك بکات، لەهەوڵی ئەوەدابووم کە مانایەك بۆ ئەو قەرەباڵغییەی بەردەمم بدۆزمەوە.

بینیم لەناو قەرەباڵغییەکەدا (ئەلیف)ی هاوڕێم بەرەو لای من ڕای کردو، باڵەکانی کردبووەوە، ڕەنگی زەردبوویوو، وادیاربوو کە تازە هاتبێتەوە هۆش خۆی لەئەنجامی شۆکی ڕووداوێکی زۆر بەئازار.

کاتێك ئەو ترس‌و شڵەژاوییەیم بینی پرسیم:

—چی بوو خاتوو ئەلیف؟

لەوەزیاتر نەیتوانی بەرگەبگرێتو باوەشی کرد بەملمداو وتی:

—ئەمڕۆ ڕۆژی ئارامگرتنە کاتی ئارامگرتنە.. هەرکەسێ پشت بەخوا ببەستێت هەر هانا بۆ لای ئەو دەبات، ئەمە تاقیکردنەوەیەکی زۆر گەورەیە.

لەلایەکەوە بەهەنیسکەوە دەگریا، لەلایەکی تریشەوە دەی ویست من بباتە ژوورەوە.

لەپڕ خورپەیەك کەوتە دڵمەوە، وەك ئەوەی بروسکەیەك بەسەرمدا تێپەڕیێو بەهەموو جەستەمدا بڵاوبێتەوە، لەناکاو هەمووگیانم گڕی گرت.

وەك ئەوەی لەخەوێك خەبەرم بوبێتەوە لەناو ترس و دڵەڕاوکێیەکی زۆردا وتم:

—چی بووە بۆ خاتری خودا! باسی بکە بزانم چی بووە؟

ئەلیف حاڵی باسکردنی نەمابوو وەك جەنازەیەکی لێهاتبوو کە خوێنی تیانەمابێت.

کاتێك بینیم چرپایەکی نەخۆش بەرەو ماڵی ئێمە هات لەجێگەکەی خۆم ڕاپەڕیم و ڕامکرد، خەریك بوو خۆم پارچە پارچەدەکرد هاوارم کرد:

—شتێك بەسەر مەسعودەکەمدا هاتووە؟

کاتێك بینیم فرمێسك لەچاوی هاوڕێکانیەوە کە ئەم لاو لای چرپاکەیان گرتبوو دەهاتە خوارێ، لەوکاتەدا مێشکم وەستا، هەموو شتێك وەستا، لەناو چرکەکاندا ون بووم.

من کێم؟ لەکوێم؟ ئەم قەرەباڵغیە لێرە ئیشی چییە؟ ئەو کەسەی لەسەر چرپاکەیە کێیە؟

لەكاتێكـدا خـەریك بـووم لـەناو خۆمـدا دەسـوتامو دەبومـە خـەڵوز، ئاگرەكـەی نـاخم ئەوەنـدە بـەهێزبوو هەناسـەكانم خـەریك بـوو قوڕگمیـان دەسوتاند.

ناوی ئەمـە ئـازارو دەردوشـتی لـەو جـۆرە نـەبوو، ئەمـە كارەسـاتێكی ئاسایی‌و مردن‌و جیابونەوەیەكی ئاسایی نەبوو.

ئەمـە واتـای پارچـە پارچـەبوونی مـن‌و دەرچـوونی ڕۆحـم بـوو، واتـای سوتان‌و گرتێبەربوونی ئومێدو خەیاڵەكانم بوو.

گوێم لەكەس نەبوو، كەسـم نـەدەدی، جگەلـە زەردەخەنـە جوانـەكانی مەسعود لەبەرامبەرمدا، هەستم بەهیچ شتێكی تر نەدەكرد.

نـازانم چـەندە خـۆمم لەدەسـت دابـوو، تەنانـەت ناشـزانم چـەندە بورابومەوە. ئای، چی دەبوو ئەگەر لەم خەونە بەئاگا نەهاتمایـەوە، چـی دەبوو ئەگەر دووبارە ئەو ناخۆشیانەم بەسەردا نەهاتایەوە.

هاتمەوە هۆش خۆم.. كە خۆزگە نەدەهاتمەوە. من چـیتر بـێ مەسـعود بـووم، چـیتر كەسـێك نـەبووم بـەناوی جانانـەوە لـەم دونیایەدا...لاشـەی بێگیانی ئەو ڕۆحی بێ ئاگای.. كۆمەڵە خەیاڵێكی بەرد ئاسابوون بۆم.

مەسعود لەگەڵ هاوڕێكانیدا بـۆ پرسـەی كەسـێكی شـارەكە چووبوون، ماڵەكە كەمێك لەشـار دووربـوو، لـەكاتی گەڕانـەوەدا سـەیارەكەیان لەگـەڵ بارهەڵگرێك لەشوێنێكی مەترسیداردا بەیەكیاندا دابوو، لەوكاتـەدا مەسـعود باسی جوانی مردن‌و باوەڕبوون بەدوارۆژی بۆ هاوڕێكانی كردبوو.

"مـردن مرۆڤـەكان بـەرەو خۆشەویسـتەكانیان‌و هاوڕێكانیـان دەبـات، مردن مرۆڤەكان بەپێغەمبەرە خۆشەویستەكەمان محمدﷺ شـاددەكاتەوە، مردن بلیتێكە بۆ ڕزگاربوون لەناڕەحەتیەكانی دونیا".

ڕێك لەوکاتەدا لۆرییەکە بەرەو ڕوویان هاتبوو، بەگوێرەی ئەو قسانەی کە هاوڕێکانی دەیگێڕنەوە، لەوکاتەدا مەسعود هاواری کردووە:

-"خوایەگیان بۆلای تۆ دەگەڕێمەوە، شاهیدی باوەڕەکەم بە".

ئەم ئازارە منی تاساند، بەهەزاران جار دوعام کرد، خوایەگیان منیش بۆلای خۆت بەرەوە. من بێ ئەو مەهێڵەوە.

خودا منی هێشتەوەو گیانی نەکێشام، بەڵام کەس لەڕەحمەتی ئەو نائومێد نابێت إن شاء الله هەر دەیکێشێت.

لەدوای ژیانێکی پڕ ئازار خەریك بوو لەجەوێکی بەهەشتی نزیك دەبوومەوە، بەڵام بەداخەوە زۆر کورتی خایاند، ئەو بەهەشتەی ژیانم بۆ دۆزەخ گۆڕا.

ڕۆحم چۆن دەتوانێت بەرگەی نەمانی عەشق‌و خۆشەویستی مەسعود بگرێت؟!

ئەگەر ئێستا هەموو زەڕەکانی لاشەم بێنە گۆ، دەبینن کە هەموویان باسی سوتانی من دەکەن، ئەو ئاگرەی ناخم هیچ کات نەڕەوییەوە.

کاتێك باوەش بەمەسعود سەعیددا دەکەم، هەست بەبۆنی مەسعود دەکەم تاکە هۆکارێکی ژیانم لەئێستادا ئەوە، ئەگەر نا من هەموو شتێکم لەژیاندا بینی.

هەموو شەوێك بۆ ڕۆحی مەسعود قورئان‌و جەوشەن دەخوێنمەوە، هەموو ڕۆژێك بەبەردەوامی سەردانی گۆڕەکەی دەکەم‌و فرمێسك دەڕێژم. جێگەیەکی تەنیشتی ئەوم بەبەتاڵی جێهێشتووە، جێگەکەی خۆمم لەپاڵ ئەودا ئامادە کردووە، بۆ من گەیشتنەوە بەمەسعود گەورەترین عیشقە.

خوا له خوشك‌و برا دینیه‌كانمان ڕازی بێت، هیچ كات به‌ته‌نیا به‌جێم ناهێڵین، به‌به‌رده‌وامی بانگم ده‌كه‌ن بۆ كۆڕ و دانیشتنه‌كانیان‌و دڵنه‌واییم ده‌كه‌ن.

هاوڕێكانی مه‌سعودیش هه‌موو پێداویستییه‌كانم دابین ده‌كه‌ن، فریشته ئاسا به‌به‌رده‌وامی وه‌ك په‌روانه به‌ده‌ورمدا ده‌سوڕێنه‌وه.

هێشتا ساڵێك تێنه‌په‌ڕیوه به‌سه‌ر له‌ده‌ستدانی مه‌سعوددا تادێت ئازاری دووری ئه‌و زیاتر ده‌بێت، بێگومان زۆر داواكاریی هاوسه‌رگیریشم لێكرا، هه‌موویانم جواب كردو له‌ده‌رگاوه ده‌رم نان.

چۆن ده‌توانم ڕێگه به‌كه‌سێكی تر بده‌م ده‌ستكاری یادگارییه‌كان‌و ئه‌مانه‌ته‌كانی مه‌سعود بكات، ده‌مه‌وێت چۆن به‌جێی هێشتم هه‌ر به‌و شێوه‌یه‌ش پێی بگه‌مه‌وه.

******

گوێگرتن له به‌سه‌رهاته‌كه‌ی خاتوو جانان و ئاشنابوون به چیرۆكی پڕ ئازارو ناسۆری ژیانی، كاریگه‌رییه‌كی گه‌وره‌ی هه‌بوو له‌سه‌رمان، له‌به‌رامبه‌ر ئه‌م ژیانه پڕ كاره‌ساته‌یدا زمانمان گیرابوو، له‌نێو سه‌رسوڕمانێكی گه‌وره‌دا بووین.

له‌كاتێكدا خاتوو جانان به‌چاوی پڕ فرمێسكه‌وه چیرۆكی ئه‌و ژیانه سه‌خته‌ی بۆ ده‌گێڕاینه‌وه ئێمه‌ش به‌چاوی پڕ فرمێسكه‌وه گوێمان بۆ ڕاگرتبوو.

ژیانی خاتوو جانان به‌شێوه‌یه‌ك كاری تێ كردبووین حه‌زمان ده‌كرد به‌زووترین كات، بابه‌ته‌كه كۆتایی پێ بهێنێت، چونكه چیتر به‌رگه‌ی گوێگرتنمان نه‌ده‌گرت. سه‌رمان سوڕمابوو له‌وه‌ی كه ئایا مرۆڤێك چۆن ده‌توانێت به‌رگه‌ی ئه‌م هه‌موو ئازاره بگرێت؟

بەڵام ئەوە خۆشەویستیو عیشقو باوەڕبوو، ئەوی بەپێوە ڕاگرتبوو. کاتێك گوێبیستی ئەو عەشقە پاكو نەمرەی خاتوو جانان بووین بۆ مەسعودی جوانەمەرگ، ئەوانە هاتنەوە بیرمان کە بەناوی (عەشق)ەوە پەلاماری گۆشتو ئیسقان دەدەن..

بەڵام لێرەدا چیرۆکی عەشقێکی ڕاستەقینە هەبوو.. بەجۆرێك پڕپەندو کاریگەربوو کە پێویست بەچیرۆکی عەشقی (مەم و زین)و (ئاسلیو کەرەم) نەبوو.

## تکاتان لێ دەکەم دوعا بۆ مەسعودی من بکەن:

کاتێك داوای ئیزنی ڕۆشتنمان لەخاتوو جانان کرد، کۆتا قسەی بەم شێوەیەبوو:

–تکاتان لێ دەکەم دوعا بۆ مەسعود بکەنو لە پاڕانەوەکانتاندا لەبیری مەکەن.

لەو کاتەدا کە هەستابوینە سەرپێ پرسیارێك هات بەمێشکمدا پرسیم:

–هیچ خەونێکتان پێوە نەدیوە؟

وتی:

–من خۆ هیچ شەوێکم بەبێ خەون بینین بەوەوە ڕۆژ نەکردوەتەوە.

–ئەی باشە لەخەونەکانتاندا چیتان دەبینی؟

–لەهەموو خەونێکمدا دڵنەواییم دەکات، دەڵێت: ئارامبگرە بەم زوانە تۆش دێیت، بەڵامناڵێت چەندە زوو!

ئەوەش تاکە هیوایەکە کە منی لەسەر پێ ڕاگرتووە، تاکە دڵنەواییم گەیشتنەوەیە بە مەسعود.

****

لەبەرامبەرمدا دۆستێکی خودا هەبوو کە لەبەرامبەر کێشەکانی ژیان ڕاوەستابوو، بەندەیەکی ئیماندار کە عاشقی هاوسەرەکەی بوو.

ئەو چیرۆکی عەشقەی کە هەموو ئەفسانەکانی لەدواوە جێ هێشتبوو نموونەی کاریگەرترین خۆشەویستی بوو بۆ پەروەدگار.

ئەو عەشقەی کە لەبەرامبەر ئەوانەی بەناوی عەشقەوە پەلاماری گۆشتو ئێسقان دەدەن، هاتبووە مەیدانو نیشانی دەدا کە دەبێت عەشقی ئەبەدیو ڕاستەقینە چۆن بێت و، تا کۆتایی دونیا بەردەوام بێت.

بەمنداڵە دەمو چاو پڕ نوورەکەی باوەشییەوە، وەك ئەوەی چاوەڕێی مەسعود بێت کە بگەڕێتەوە بۆلای بەردەوام چاوی لەڕێی بوو.

بەجۆرێك وانەی ژیانی بۆ وتین کە خەریك بوو لە هۆش خۆمان دەچووین.

جانان خاتوون... نموونەی عەشقو خۆشەویستیو دۆستی هەمیشەیی بوو، لەبەرئەوەش وەك ئاو و خواردن چاوەڕێی "مەرگ"ی دەکرد، ئەو دەیزانی کە "مردن" بلیتێکە بۆ گەیشتنەوە بە دۆستە هەمیشەیییەکەی دڵی ئەویش بەبەردەوامی بۆ ئەمە لێ دەدات...

هەرکاتێك باسی خوداو، ئاخیرەت و مەسعود بکرایە، بەو فرمێسکانەی کە لەچاوەکانی دەهاتنە خوارەوە، گێژەڵووکەی ناخی دەهێنایە گۆ.

خاتوو جانان ئامادەبوو بۆ سەفەرێکی هەتاهەتایی، بۆ باوەشی مەعنەوی پێغەمبەری خوداو بۆ ئەو عەشقەی کە ناخی سوتاندبوو. ئەمە خواستی ڕاستەقینەی ئەو بوو.

بە بەرماڵەکەی بەردەمی و قورئانەکەی دەستیو شەهادەتی سەر زمانی و بەو باوەڕە بەهێزەیەوە ئامادەبوو بۆ ئەو سەفەرە.

تەنانەت ئەوەندە ئامادەبوو کە لەتەنیشت کاك مەسعودەوە گۆڕێکی بۆخۆی سازکردبوو و هەموو ڕۆژێك سەردانی دەکردو باوەشی بۆ ئەو دونیا مەعنەوییە دەکردەوە.

ئای خاتوو جانان، خۆزگە ئەو عیشقە نەمرەت کە بۆتە وێردی سەر زمان ببێتە نموونەیەکی بچووك بۆ ئەوانەی کە عەشقیان خستووە بەزەویداو بەناوی عەشقەوە پەلاماری گۆشتو ئێسقان دەدەن، من دڵنیام ئەگەر ئەوانیش تێبگەیشتنایە ژیانیان بەتەواوی دەگۆڕا.

بەڕێزو حورمەت و چاوی پڕفرمێسکەوە ماڵئاواییمان لە خاتوو جانان کرد، ئەو خانمەی کە دڵنیام چیرۆکی ژیانی دەماو دەم بڵاو دەبێتەوەو دەبێتە ڕابەرێکی نەمر بۆ ئەوانەی هەمان ژیانی ئەو دەژین.

لەبەر چی؟

چونکە هەموو جانانێك مەسعودێکی هەیە.

ئێوەش دڵی خۆتان بگەڕێن..

بزانن لەکوێی خۆشویستن لەبەرخاتری خوادان!

تا چەندە بۆ ئەو سەفەرەو ئەو دادگاییە گەورەیە ئامادەن!!!

# پێڕست

پێشەکی.......................................................٣
لەبەرامبەر ئەم بەسەرهاتەدا دەستم کرد بە گریان.................٧
بەشی یەکەم: باوکو دایکم خاوەنی دوو ئایینی جیاواز بوون........٩
بەشی دووەم: دایك و کچ لەناوەڕاستی جادەکە جێهێڵرابووین.......٢٩
بەشی سێیەم: ڕۆژە سەختەکان چاوەڕێی ئێمەبوون..................٣٩
بەشی چوارەم: فریشتەی چاکەخواز (مامۆستا سێڤگی)...............٤٩
بەشی پێنجەم: ئەگەر باوەڕم بەدوارۆژ نەبوایە، هەزارجار هەوڵی
خۆکوشتنم دەدا.................................................٦٧
بەشی شەشەم: نەگبەتیەکان تەواو نەدەبوون......................٨٧
بەشی حەوتەم: دەستم بە دەوام کرد لەقوتابخانەکەم، بەڵام گورگە
برسییەکان بۆنیان کردبووم.....................................١٠٣
بەشی هەشتەم: زانکۆم بەدەست هێنا، بەڵام شۆکی ژیانم لێرەدا
بەسەرمدا هات..................................................١٢٧
بەشی نۆیەم: شەوو ڕۆژ بەخەیاڵی ئەوەوە دەنوستمو هەڵدەستام١٦٥
بەشی دەیەم: بەهەشتی ژیانم لەناکاو گۆڕا بۆ دۆزەخ..............١٧٩
پێڕست........................................................١٩٠